

# قەندیل بەغدای هەژاند

## بەشی یەکەم



نوسینی
ڕێباز

# قەندیل
# بەغدای هەژاند

ناوی کتێب : قەندیل بەغدای هەژاند

بابەت : یاداشتەکانی پێشمەرگایەتی لە ساڵانی ١٩٧٦ - ١٩٨٠

نووسەر : رێباز

پێداچونەوەو نەخشەسازی کۆمپیوتەر: بەختیار عەلی حەمە

هەڵەبڕ : م / جەمیل عیسا

تایپ : رووبار

چاپی دووەم : سلێمانی ٢٠٠٨

تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

چاپ : چاپخانەی پەیوەند.

لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی بنکەی رۆشنبیری شەهید ژمارە ( ٢٠ )

ژمارەی سپاردنی ( ٢٥٢٨) ی ساڵی ( ٢٠٠٨ ) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

لەسەر ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری بە چاپ گەیەندراوە

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

## پێشەکی چاپی دووەم

پێشمەرگەی ناوداری کوردستان‌و نووسەری چاونەترس شەهید ڕێباز (١٩٥٢- ١٩٩٤) بەرگی یەکەمی کتێبی قەندیل بەغدای هەژاند لە ساڵی ١٩٩٣ دا و پێشتریش لە ساڵانی ١٩٩١ و ١٩٩٢ دا هەردوو بەرهەمی (ترکەی کوردستان)و لە ساڵی ١٩٩٠ دا نامیلکەیەکی بەناوی (شعری پارتیزانی) کە لە ئەزموونی ١٤ مانگەی ژیانی پارتیزانی دوای ئەنفالەکان بوو ، لە ساڵی ١٩٩٤ دا بەرگی دووەمی قەندیل بەغدای هەژاند بڵاوکردۆتەوە .

هەندەی پێنەچوو ئەم بەرهەمانە لە کتێبخانەکانی کوردستان دانەیەکیشی دەست نەدەکەوت ، بۆیە خەڵکێکی یەکجار زۆر لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان هەمیشە هەڵوەدای کتێبەکان بوون .
هەرچەندە لەدوای ڕاپەڕینەوە چەندین گۆڕانکاریی‌و ڕووداوی تر ڕوویاندا بەڵام بەچاپ گەیاندنەوەی کتێبەکانی شەهید ڕێباز بەتایبەتی بۆ نەوەی دوای ڕاپەڕین گرنگیەکی بەرچاوی دەبێت‌و بەرچاو ڕوونیەکی کاریگەریشە بۆ ئەو نەوەیە .
بەرهەمەکانی شەهید ڕێباز ویژدانی مرۆڤێکە سەرتاپای ژیانی سیاسی‌و پێشمەرگایەتی لە خزمەتی گەلەکەیدا بوو ، پارێزەری میللەت‌و پێشمەرگە بووە بۆیە هەمیشە لە ناخی گەلەکەیدا دەژی .

**کتێبەکان دوو ئامانجی سەرەکی پێوە دیارە :**

١- باوەڕ بەخۆ بوونی گەلێك بەوە نیشان دەدات‌و دەیکات بە چیای قەندیل بۆ هەژاندنی دەسەڵاتێکی شوڤێنی‌و دکتاتۆری کە لە بەغداد حوکمڕانی دەکات .

٢- نەشاردنەوەی مەسەلەکان‌و دەرخستنی ڕووداوەکانە وەك خۆی .

پێویست ناکات هیچ قسەیەکی تر لەسەر شەهید ڕێبازو بەرهەمەکانی بکەین چونکە کتێبە تایبەکانی جوانترو بە دیهەرگیزترە لە هەر قسەیەکی تر .
وەڵامی ئەو پرسیارەش بۆ خوێنەری بەڕێز جێ دێڵین ، ئایا ڕێباز کێ بوو وا ویژدانی هەژاند ؟
لە کۆتاییدا ئەوە جارێکی دی کتێبەکانی قەندیل بەغدای هەژاند بە هیممەتی وەزارەتی ڕۆشنبیریی‌و بەڕێوەبەرایەتی چاپ‌و بڵاوکردنەوەی سلێمانی دەخەینەوە بەر دیدەی خوێنەران ، بۆ ئەوەی ئەبادا بەغدا یان هەر بەغدایەکی تر قەندیل بهەژێنێت .

نیعمەت عەبدوڵا پیرداود
١٩ / ٧ / ٢٠٠٨
هەولێر

## پێشەکی

یاداشت نووسین کارێکی وا ئاسان نیە، کە هەندێ کەس بیری لێدەکاتەوە بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ ئازارو ناخۆشی گەلەکەیان دەژین، چونکە کەم کێشە هەبووە لە دنیا وەکو کێشەی گەلی کورد ئاڵۆز بێت، ئەوەندە کارەسات و هەورازو نشێوو هەڵسانەوەو دامرکاندنەوەی تیادابێت، ئەوەندە دوژمنی گەورەو بچووك و هەمەرەنگی بەگژدا هاتووە .

ڕاستە گەلانی دنیاش چەرمەسەری و مەینەتی زۆریان کێشاوە تاکو ئاڵای سەربەستی و سەربەخۆی و ڕزگاریان بەرز کردەوە کەچی میللەتی ئێمە سەرباری ئەو هەموو دەربەدەری و ماڵ وێرانیەو کوشت و کوشتارە هێشتا هەنگاوی مەزنی پێویستە بۆ سەرکەوتنی یەکجاری ئەگەر ڕاستی ڕوون بکەینەوە دەبێ ئەوە بسەلێنین، کە هێشتا گەلی کورد یان شۆڕشگێران دۆست و دوژمنیان دیاری نەکردووە یان باش دەست نیشانیان نەکردووە بە واتایەکی تر کورد دۆستی ڕاستەقینەی نەبووە بەڵکو دۆستی درۆزنی زۆر بووە، دۆستانی کورد (زمان هەنگوین و دڵ ڕەشن).

بۆیە زیندوو کردنەوەی کارەکانی چەند ساڵ لەمەو پێش زۆر شتی بە کەڵك و پڕ تاقیکردنەوەمان فێر دەکات لە هەمان کاتیش زۆر برینی کۆن دەکولێنێتەوە .

نووسینەوەی مێژووی بیست ساڵی شۆڕشی کوردستان بۆ پێشمەرگەیەکی هەژاری وەکو من وا ئاسان نیە، دەبێ هەقی کەس فەرامۆش نەکەم، ڕۆڵی هیچ کەسێك لەبیر نەکەم، ژێر کەوتن و سەرکەوتنەکان بخەمە پێش چاوان، تێکۆشەرو نا تێکۆشەران لێك جیابکەمەوە، هەلپەرست و خۆنەویستەکان لێك جیاواز بکەمەوە . ئەو هەمموو بێنەو بەردەیە بە دڵی هەمووان نابێ، هەڕەشەو گوڕەشەم لێدەکرێ هەر بۆیە ماوەیەکی زۆرە ئەو نووسینەم دوا خست لە هەلێکی زێڕین دەگەڕام تا منیش وەکو هەلپەرستان هەل بقۆزمەوە لەو هەلە سوود وەربگرم زۆر چاوەڕوانم کرد مەیسەر نەبوو، لەعنەتم لە شەیتان کردو ناوی خواو پێغەمبەرم لێهێنا سەر لە نوێ پاك نووسی نووسینەکەم کردەوە، وتم : منیش مافم هەیە سوود لەو ئازادی و دیموکراتیە وەربگرم، خوا نەخواستە نامەوێ لە پەنا دیموکراتیەت سەرەتاکان پێ شێل بکەم..!

بیست ساڵی ڕەبەقە لە خەباتی چەکداری بەشداری دەکەم هەردوو شۆڕشەکەمان ئەیلول و شۆڕشی نوێ تووشی نوجدان و شکست هاتن، هەردووکیان سەر لە نوێ بوژانەوە . شۆڕشی نوێ

شۆڕشی ئەیلولی خستەوە سەرپێ ، ڕاپەڕینی گەلەکەمان لە بەهاری ١٩٩١ شۆڕشی نوێی خستەوە جۆش‌و خرۆش .

منالێکی لادێیی بچوک بووم ، کە شۆڕشی ئەیلول هەلگیرسا، هەر زوو بەعسیەکانی ساڵی ١٩٦٣ ئەوانەی عەبدولکەریم قاسمیان شەهید کرد گوندەکانی کەندیناوەیان سووتاندو خەڵکەکەیان ئاوارەو سەرگەردان کردو عەرەبیان نیشتەجێ کرد، لە گوندی ئێمە (دەربەندی گۆم) چوار کەسیان شەهید کردو هەرچی خوا دابووی ، بە ڕەنج‌و شانی هەژارەکان کە چەندین ساڵە کۆکرابوەوە بە تاڵان بردیان . لە سایەی حوکمی بەعسیەکان تووشی ڕۆژی ڕەش هاتین ، بەهەژاری‌و نەداری‌و کولەمەرگی ساڵمان بەرێ کرد، چاوەڕوانی هەلێك بووین تا تۆڵەی خۆمان لە دوژمنان بکەینەوە .

ڕۆژ هات‌و ڕۆیی ، سەری سەردارانی زاڵم کەوتە بەر گوێی میللەت‌و ڕۆژانی خۆشیان لێ بووە خەون .

چەند ساڵ هات‌و ڕۆی ، چەند سەرۆك گزیر گۆڕکران‌و تێ هەڵدران ، ئێمەش گەڕاینەوە جێگاو ڕێگای خۆمان .

لەوێ ڕادەستمان بە کوردایەتی کرد، جێگای ڕاستەقینەی خۆمان دۆزییەوە ئەگەر لە پێشەوەی خەباتدا نەبووبین لە هەلپەرستانیش نەبووین ، کە لە ڕۆژی خۆشیدا سنگ لە پێش بین .. !

شۆڕشی ئەیلول چواردە ساڵی خایاند بە زۆر قۆناغدا تێپەڕی زۆر کاری باشی بۆ میللەت کرد ، گەلێك شەڕو پێك دادانی لەگەڵ دوژمنی کورد کرد . بە هەزاران پێشمەرگەو خەڵك شەهید کران ، هەندێك ئاگردان کوێر بوونەوە شەهیدانی گوندی ناسر لە بناری قەرەچوغ خانەوادەی مام صادق سەرمەزرایی ، کە کوڕە تێکۆشەرەکانی سلێمان صادق‌و محمد صادق‌و ستار صادق نموونەیەکن لە هەزاران کارەساتی دڵ تەزێنی ئەوها .

بە هەزاران کەس لەسەر خوێنی شەهیدان خۆیان دەوڵەمەند کرد، بە هەزارانیش هاتنە سەر ساجی عەلی‌و زەرەرو زیانی مەزنیان لێکەوت، زۆر دایکی جەرگ سووتاوم بینی بۆ کوڕە تاقانەکەی ڕۆ ڕۆی دەکرد .

شۆڕشی کورد دوژمنانی کوردی گەیاندەوە یەك ، بەرژەوەندییەکان لە شۆڕشی ئەیلولدا ڕەچاو دەکرد، شۆڕشی ئەیلول هەر ئەوەندە نیە ، کە باسم کردوە ، سەدان ئەوەندەش بڕی ناشکێنێ، کێشمەکێشی زۆر لێ ڕوودا‌وە، پەیوەندیەکانی ناوخۆو دەرەوە دەیان ئەوەندە نووسینی دەوێ بڕوا ناکەم بە پێشمەرگەیەکی سادەی وەك من بنووسرێتەوە هەر ئەوەندەم باس کردوە ، کە تێکۆشانی

خەڵکی کوردستانتان بیر بێنمەوە دڵنیام ئەوانەی خاوەنی ئەو مەسەلەیەن یان زۆرتر دەزانن دەربارەی شۆڕشی مەزنی ئەیلول ڕۆژێك دێت بە درێژی دەینووسنەوە .

شۆڕشی نوێی کوردستان کە لە هەلو مەرجێکی وا دژوارو پڕ ئەستەم دەستی پێکردەوە شایانی ئەوەیە دەیان پەرتووکی لەسەر بنووسرێ ، دەست پێکردنەوەی شۆڕش خۆی لە خۆیدا پاڵەوانێتیە ، حکومەتی عێراقی والە خۆبایی‌و بەهێز، ئەوەندە تینو بە خوێنی گەلەکەمان بە رەنگاربوونەوەی کارێکی ئازایانەو دلێرانەیە . ڕژێمی عێراق پاش شکستی شۆڕشی ئەیلول وەکو سەگی هاری لێهاتبوو، هەر کسێك بۆنی کوردایەتی لێبهاتایە بە قەمە دەیکوشت .

بەعسیەکان دروشمی نەمانی کوردیان هەلگرتبوو ، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو سیاسەتەیان بە کردەوە پیادە دەکرد . دەیانویست کورد نائومێد بکەن‌و کوردایەتی لە دڵو دەروونی خەڵك دەربهێنن‌و وەکو کوردەکانی برامان لەسەرو لێبکەن‌و پەرتەوازەمان پێبکەن ، تاکو بێ خاکمان بکەن وە بە ئارەزووی خۆیان پیلانە بۆگەنەکانیان جێبەجێ بکەن .

بەڵێ لەو ڕۆژەدا، کە تاریکی باڵی رەشی سامناکی بەسەر کوردستان کێشابوو لەو ڕۆژە ، کە کورد خۆی لە خاکی خۆی بە بێگانە دەزانرا ، لەو ڕۆژە ، کە کەرامەت‌و شەرەفی کورد پێشێل دەکرا لەو ڕۆژە کە بەعسیەکان تیغیان زیاتر تیژ دەکرد تا سەری هەموو کوردێکی پێ ببڕن ، لەو ڕۆژە کە سیخورەکان‌و کاسە لیسەکان وەکو هەژدیها کەوتبوونە ناو خەڵك ، لەو ڕۆژە کە هەڕەشە لە بوونی کورد بە تێکڕا دەکرا، لەو ڕۆژە کە برا لە برای خۆی دەترسا، لەو ڕۆژە کورد ژیانی لێ تاڵ ببو، لەو ڕۆژەی کە زنجیرەی پیلان لەسەر کورد زۆرتر دەبوو، لەو ڕۆژەی ، کە دنیا پشتیوانی لە ڕژێمی عێراق دەکرد، چەند تێکۆشەرێکی ئەو میللەتە هەژارو بێ کەسە بێ ئەوەی هیچ پشت‌و پەنایەکی دەرەوەی هەبێت ، بێ ئەوەی هیچ یارمەتییەك هەبێت بە چەند چەکێکی کۆنی شاردراوەی ژێرزەمین بە رەنگاری ئەو ڕژێمە بە هێزو لە خۆباییە بوونەوە کە تا کورد مابێ جێگای شانازین‌و کارێکی ئەوەندە دلێرانەو ئازایانەو مەردانەیان ئەنجامدا کە کەم میللەت لە دنیا بە خۆیەوە بینویەتی .

پێ بەپێی ئەو شۆڕشە بەشداریم تیا کردووە ، زۆر کارەساتی دڵ تەزێن‌و ڕووداوی جەرگ بڕی بەسەر هاتووە .

ویستیان ئەو شۆڕشە لە بێشکەدا بکوژن بۆیان نەکرا، دەوڵەتانی دراوسێمان هەر چی لە دەستیان هاتبێ کردوویانە بۆ ئەوەی شۆڕشەکەمان پێ ڕەوانەبێ ، بۆیان نەکرا ، دۆستایەتیشیان کردیین هەر بۆ ئەوە بووە بمان کوژن..!

ئەو شۆڕشە تووشی چەندین گلان بوو، تووشی شکستی گەورە هات تووشی هەورازی سەخت بوو، تووشی کۆسپی ئەستەم بوو .. هەمووی بڕیو کۆڵی نەدا، کە دەگەڕاین دەبووینەوە سوار چاك ، کە دەشکاین دەرمان وەردەگرتو سەرکەوتن چاوەڕوانی دەکرین ، کۆسپەکانمان تەخت دەکرد، پیلانی دوژمنان ووردوخاش دەکرا . هەموو ئەو کارانە وا بە ئاسانی نەکراوە بە خوێنی هەزاران ڕۆڵەی گەلەکەمان، بە ماندوبوونی تێکۆشەرانی میللەتەکەمان، بە لەخۆ بوردویی جەماوەری کۆڵنەدەری کوردستان ئەنجام دراون .

شۆڕشی نوێی کوردستان بە ماندوبوونو شەونخونی پێشمەرگەکانی کوردستان بڵێسەی لەسەر هەموو شاخەکانی کوردستان هەر بەردەوام بوە . لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان ئەوەندە کاری مەردانەو شەرەفمەندانە کراوە دوژمنان پێش دۆستان شاهێدی بۆ دەدەن، ئەو شۆڕشە دوژمنی هێنایە لەرزین ، کوردی لە نەمان ڕزگار کرد، شەرەفو هەیبەتی کوردی کڕییەوە، بە دوژمنی سەلماند، کە ڕۆڵەکانی کورد ئامادەن گیانیان لە دەست بدەن بەڵام کوردستان لە دەست نادەن شۆڕشی نوێی کوردستان، داستانێکی مێژوویی زیندوە نەوەکانی دوا ڕۆژ بە سەربەرزیەوە بۆ خۆیان دەیهێڵنەوە . مەفرەزە سەرەتاییەکان، مەفرەزە پارتیزانەکان، ئەو پێشمەرگە ڕەسەنانەن، کە مێژووی کوردیان سەر لەنوێ بە وشەی زێڕین نووسییەوە، بە هیمەتی ئەوان ئەو وشانەیان لە مێژووی کورد سڕییەوە، کە کورد بێژی لێدەکاتەوەو جێگای نابێتەوە لە مێژووی گەلێکی قارەمانی وەك کورد. شۆڕشی نوێی ئەو جارە، تۆڵەی لە دوژمنان کردەوە نەیهێشت خوێنی بە ناهەق ڕژاو بە فیڕۆ بڕوات . لە مێژ بوو دەمویست باسی داستانی شۆڕشی نوێتان بۆ بکەم داخەکەم لەبەر ئەوەی نووسینەکانم هەر هەندێ لە قوژبنێك، لە ئەشکەوتێك، لەبن بەردێك شاردبوومەوە، یان لە ماڵە جووتیارەکان دام نابو، هەندێکیان وەکو سەروەتو سامانی جووتیارەکان فەوتاو بە ناچاری سەر لەنوێ دەستم پێکردەوە سەرلەبەر مێژووی شۆڕشەکەم نووسیەوە، چەند جارێك پێیدا هاتمەوە ئەوەی لەگەڵ بارو دۆخو کاتی ئێستا دەگونجێ وا دەیخەمە بەر دەستان دڵنیام لەوەی، کە ڕاستیەکانم خستۆتە ڕوو جا ئەگەر هەندێ جار باسی خۆم تێدا کردبێ گومانت نەبێ دەزانم بەخۆ هەڵکێشانی دەزانن منیش دەزانم باس کردنی کەسێك هەڵپەرستانەیەو خۆ پەرستیە بەڵام نوسینەکە وا هەڵدەگرێ دەبێ ببوورن .

خاتر جەم هەموو مەسەلەکانم باس نەکردووە ئێوەش ڕازی نابن هەمووی بنووسم، شتی گرنگ هەیە، زۆر شتی سەیرو سەمەرە هەیە نەکرا بینووسم جارێ با وابێ تا فرسەتێکی تر ئەگەر خوا تەمەنی دامو قەڵەمەکەم تووشی گێچەڵی ناکەس بەچان نەهات ئەوا حاڵیتان دەکەم

له کوردستان چ باس بووه ئەوجا دەزانن له شاخەکانی کوردستان چ قەوماوە... پەلەم لیّ مەکەن پەیمان دەدەم هیچ شتێکتان لیّ نەشارمەوە .

له شۆڕشی ئەو جارەی گەلەکەمان داستانی مەزن‌و شەڕی پیرۆز کراوە هەر بۆ ئەوەی چاکتر ئاشنایەتی پەیدا بکەن لەگەلّ شۆڕشەکەتان بە نموونە چەند شەڕێکی قارەمانانم بۆ باس کردوون .

پازدە سالّ له شاخ‌و دۆلّ‌و دەشتەکانی کوردستان بە پێشمەرگایەتی ژیانم بردە سەر له هەزاران مالّە جووتیار نانم خواردووە، هەورامان، شارەزوور ، شارباژێڕ، جافایەتی‌و مەرگەو پشدەرو مەنگوڕایەتی‌و قەرەداغ‌و گەرمیان‌و چەمی ڕێزان‌و شوان‌و شێخ بزینی‌و سالەیی‌و دەشتی کۆیەو خۆشناوەتی‌و بالەیان‌و گرتك‌و روستەو ، بەرانەتی‌و خوا کورك‌و هیەتی‌و بەرازگرو کوردستانی رۆژهەلات‌و بناری کۆسرەت‌و دەشتی هەولێرم بست بە بست بە پیادە گەڕاوم‌و شارەزای ژیانی کۆمەلایەتی‌و ئابووریيان بووم .

سەدان یادگاری تالّ و شیرنم هەیە، یادگاری ئەو ئازیزانەی سەنگەری مەردایەتی بەیەکەوە بە کولە مەرگی ژیانمان بە ڕێکرد چۆن له یاد دەکریّ، ئەو پێشمەرگانە ئەو شابازو هەلّۆیانە هەموویان یادگاری شیرنن . یادی ئەو ڕۆژانە چەند شیرینە کە بەیەکەوە هەلّان دەکوتایە سەر دوژمن .

یادی ئەو ڕۆژانە هەرگیز لەبیر ناکریّ، کە هەموومان بەیەکەوە شەو له مزگەوتەکانی گوندەکان دادەنیشتین هەریەکە باسی ئازیزانی خۆی دەکرد .. بەلّی من ناتوانم هاوسەنگەرانم لەیاد بکەم، ناتوانم پازدە سالّ برادەرایەتی بەیەکەوە خەبات له شاخ بخەمە ژێر پیّ ئەوە کاری پیاوی هەل پەرستە ..

دەشتی هەولێر هەوارگەی کوڕانی قەرەچۆغ‌و کەندیناوەو شەمامك‌و مرکیەو دیدەوان گەورەترین نیشانەی شەرەفە بۆ ئێمە . هەلپەرست نین‌و هەرگیز نابین .

شەهیدەکان .. ئەوڕۆلّە بەوەفایانە بوون ، کە قەرزی خۆیان دایەوە میللەت هەموویان گلێنەی چاوان بوون، هاوسەنگەر بوون، دۆست‌و ئازیزو برا بوون، مردن‌و ژیانمان بەیەکەوە بوو، ناوەکانیان یادگارێکی مەزنە بۆ منی پێشمەرگە . سەید کەریم، سەردار سەعید صۆفی، دەشتی حەمەد ئەمین، کاکە ڕەنجە، یوسف جەمیل، عەریف ئەکرەم، مەجیدە سوور، عومەر عەوێنە، باقی بارزانی، مەناف، کاك جوامێر، عەلی پونگینە، ڕەوەند، وشیارە سوور، کاکە عەبدولڕەزاق، حەیدەرچوکل، ئارام، ئازاد هەورامی، عەلی صالح، هاوڕیّ کاوە، سەدانی تر لەو شەهیدانە، کە دۆستی ئازیزو هاوسەنگەری ڕۆژی تەنگانە بوون چۆن له یاد دەکرێن . ژیان هەر

خواردن‌و نووستن‌و کەیف‌و سەفا نیە، ژیان هەر ڕابواردن نیە پیاسەی سەر شەقامەکان‌و پارەو پوول نیە .. بەڵکو ژیان خەباتە .. ژیان مردنە بۆ ژیان . ئەو کەسە ژیاوە کە خزمەتی ژیانی هەموو کەسێك بکات ژیان پلەو پایەو کورسی بەرز نیە ... ژیان خۆ هەڵکێشان‌و خۆ بادان نیە .. بەڵکو ژیان شکانی کورسی زۆردارانە .. ژیان تف کردنە لە پلەو پایە .. هەر بۆیە مردن لە پێناوی خۆش کردنی ژیانی گەل ژیانێکی هەتا هەتاییە .

دەکرا ئێمەش خاوەن قەسرو تەلاربین .. چاك دەکرا ئێمەش لەسەر خوێنی گەلی خۆمان پایە داربین، دەکرا پێش دوژمن بکەوین ویژدانی خۆمان لە دەست بدەین .. بەڵام هیچمان نەویست‌و هیچمان ناوێ، خۆمان کردە ڕێبواری ڕێگای کوردایەتی هەر ئەوەندەشە، کە لە دوا ڕۆژ ببێتە مایەی ڕێبواری ڕێگای کوردایەتی هەر ئەوەندەشە، کە لە دوا ڕۆژ ببێتە مایەی شانازیمان .

پێت وانەبێ هەرچی کردومانە باش بێت، زۆر کاری خراپیش ڕووی داوە لەو هەل‌و مەرجە ناسکە لەو دۆخە پڕ لە ئاڵۆزو کێشمە کێشمە کاری نارەواش کراوە شەڕی براکوژی دەردێکە کورد هەتا هەتایە پێوەی ئەگیناڵێنێ، دووبەرەکی‌و خۆ بەزل زانین‌و خۆشەویستی کورسی‌و ناو ناوبانگ دەردی سەرەتانە بۆ کورد چارەی لە مەدای نزیك زۆر ئاستەنگە . دەردی شاخ‌و شاریشی گرتۆتەوە . زۆر جووتیارو پیاو چاك ئازار دراوە زۆر نابووت‌و ترسنۆك هەلیان قۆزتۆتەوەو لە پەنا شەڕی عێراق ـ ئێران خۆیان بردۆتە پێشەوە کەچی لە ترسی مردن شۆڕشی کردە مەنزلگا. زۆر ورگ قوپاو بوونە سك زل‌و گەلێك کاری خراپ تریش، ئەوە بەشی یەکەم لە یادگارەکانی شۆڕشتان پێشکەش دەکەم‌و خوایار بێت لەو نزیکانەش بەشی دووەم‌و سێیەم دێتە نووسینەوە .
یەك مەسەلە هەیە حەز دەکەم بە ڕاشکاوی بۆتان باس بکەم ئەویش : ـ

ڕەنگە ناوی هەندێ تێکۆشەرم لە یاد کردبێ دەتوانن پێش ئەوەی بمدەنە بەر تانەو تەشنە ئاگادارم بکەن تاکو لە بەشەکانی تر جێگای شایستەی خۆیان بگرنەوە . ئەو تێکۆشەرانە هی هەموو حزب‌و ڕێکخراوەکانی کوردستانن بەبێ جیاوازی چونکە شۆڕشی هی ڕۆڵەکانی گەلی کوردە .

بڕیار وابوو شەهیدی نەمر حاکم جەمال بە نووسینەکانمدا بچێتەوەو دارشتنەوەو کەم‌و کوریەکانم بۆ ڕاست بکاتەوە ، بەڵام حەیف دەستی ڕەشی چەند چەتەو ڕێگرو خۆفرۆشێك ، کە لە پەنای خۆمان خۆیان شاردبووەوە بە گوللەی ناپاك کاکە جەمالیان شەهید کردو لە دەستیان داین .

هەر بۆیە کاکە جەمال جێگای شایستەی خۆی هەیە لەناو ئەم پەرتووکە ، حەز دەکەم ئەوەش ڕابگەیەنم پێش شەهید بوونی سەرجەم نووسینەکانی خۆم دایە دەستی بەڵام داخی گرانم پێڕا نەگەیشت تێبینی خۆی بنووسێ ، ماڵ ئاوایی یەکجارەکی لێکردینو گەیشتە کاروانی لە پسان نەهاتووی گەلەکەمانو برینی گەورەی لە دڵی من دروستکرد بڕوا ناکەم وا بە ئاسانی سارێژ بێت سڵاو لە جەماله سوورو شەهیدان یادتان هەر بەخێر بێت .

هەقە پڕ بە دڵ سوپاسی هاوسەنگەرو برای ئازیز مامۆستا بەکر بکەم ، کە هەندێك لە نووسینەکانی پاراستمو ئێرانو تورانی پێکردو یارمەتی دام بۆ بە چاپ گەیاندن .

لە کۆتاییدا داوای لێبووردن دەکەم لە هەمووتان ئەگەر کەمو کوڕیەك بەر چاوتان کەوت ، هەر چەند ملکەچم بۆ هەموو ئەو کەسانە کە ڕەخنە لەو نووسینە دەگرن توانجیش بدەن بەبرا گەورەیان دەزانم . ئیتر دوا قسەم ئەوەیە ، کە هەموومان یەکگرتووبین خۆمان پێ ڕزگار دەکرێ .. هەر بژین .

دڵسۆزتـان

ڕێـبــــــاز

## شەهید ڕۆستەم عەلی سوور

باوکی کادیرێکی بەناوبانگی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. خەڵکی ناوچەی شەمامکی دەشتی هەولێرن یەکێکن لەو خێزانانەی، کە بە تەواوی قەرزی خۆیان داوەتەوە گەلی کوردستان شەشەمین شەهیدی بنەماڵەکەیانە چوار برای تری هەر لە شۆڕشی نوێ شەهید کران باوکیشی هەر لە پێشمەرگایەتیدا تووشی نەخۆشی بوو و پاشان گەیشتە کاروانی شەهیدان .

کاکە ڕۆستەم لە کاتی ئەنفالەکاندا کەوتە بەردەستی ڕەوە جاشێکو بە نامەردی لە نزیک فولکەی کانی بزرە لە نزیک قوشتەپە شەهیدیان کرد .

## شەهید مەلا ئاراس

خەڵکی ناوچەی شێخ بزێنی شاری کەرکوکە ، لە حوجرەی فەقێکانی سێگردکان قورئانی تەواو خوێندووە ، هەر لە حوجرەی ئەو فەقێ تێکۆشەرانە پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان کردووە .

شەهید هەر زوو پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد سەرەتا لە دەزگای ڕێکخستن کاری کردووە ، بووە بە کادیر لە ناوچەی کەرکوك توانی جێگای خۆی لەناو دڵی جەماوەری ناوچەکە بکاتەوە ، لەبەر ئازایەتی‌و لێوەشاوەیی خۆی کرا بە فەرماندەی کەرتی ١ ی تیپی ٢١ ی کەرکوك لە ساڵی ١٩٨٣ کرا بە جێگری فەرماندەی تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر پاشان بوو بە سەر تیپی مەڵبەندی ٣ دوای ماوەیەکی ترگوازرایەوە ناوچەکەی خۆیان‌و لێپرساوێتی تیپی ٢١ ی کەرکوکی پێسپێردرا .

شەهید لە دەیان چالاکی بەشداری کردووە زیاتر لە ٥ جار بریندار بووە بە دەیان پارچە ساچمەی لە لەشیدا مابووەو دەستێکی سەهەرگیز بوو .

شەهید مەلا ئاراس پاش شەڕێکی قورس لە ڕۆژی (                ) لەلایەن پیلاتۆزەکانی ڕژێم تەقەی لێکراو شەهید کرا .

# شۆڕشی ئەیلول

لەبەرە بەیانی ڕۆژی ١٤/ ٧/ ١٩٥٨ ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق گۆڕ کرا ، مەلیک فەیسەڵو نوری سەعیدو داروودەستەکانیان کوژران و لەناو بران ، عەبدولکەریم قاسم ئەفسەرێکی نیشتمان پەروەر بوو، سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە مەزنەی عێراقی کرد، زۆر کاری لە قازانجی گەلی عێراق کرد، هاتنە دەرەوەی عێراق لە پەیمانی (سەنتۆ)، کە عێراق، ئێران، تورکیا، پاکستان، ئینگلیز بە هاوکاری ئەمریکا دایان مەزراندبوو بۆ لێدانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی ڕۆژهەڵات بەتایبەتی بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد لە هەر چوار پارچەکەی ، نەهێشتنی ئاغاو دەرەبەگ لە سەرانسەری عێراق و دابەش کردنی زەوی و زار بەسەر جووتیارەکان، ڕێگادان بە گەڕانەوەی کوردە ئاوارەکان بە تایبەتی خوا لێخۆش بوو سەرۆک بارزانی نەمر لە یەکێتی سۆڤیەت، ئازادکردنی حزبە سیاسیەکان و گەلێ کاری جوامێرانەی تر، عەبدولکەریم قاسم ئەوەندە لەناو خەڵك خۆشەویست بوو سوێند بەسەری دەخورا خەڵك بە (زەعیم)یان ناو دەبرد، لە کاتێك لە پلەی فەریقیدابوو هەر بە ناوی زەعیم عەبدولکەریم ئەگیناسرایەوە . شوعیەکان بەهی خۆیان دەزانی کەچی فری بەسەر شوعیەتەوە نەبوو زۆر جار گێرو گرفتی بۆ دروست دەکردن، ئەوبرا شوعیانە ئەوەندە عەبدولکەریمیان بەرزکردبووەوە زۆر جار لە کۆبوونەوەو ڕۆژنامەکانیان بە زەعیم (الاوحد)یان لە قەڵەم دەدا، ڕەنگە ئەو هەموو پیاهەڵدان و هەڵگوتنە هۆیەکی گرنگ بێت بۆ ئەوەی عەبدولکەریم تووشی مەغرووری ببێت و گرنگی بە قسەی کەس نەدات . گەلی کوردیش لە سایەی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ بوژایەوە ، پارتی دیموکراتی کوردستان لە سەرانسەری کوردستان بەرەو گەشەکردن و پەل هاویشتن هەنگاوی نا مۆڵەتی فەرمیشی وەرگرت ، لە ڕووداوەکانی ئەو کات هیچم بیرنیە نازانم چی کراوە ، کێشەکان لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم لەسەر چی دروست بووە ، بەڵام کە بەراوردی دەکەم و لە خەلکی دەبیستمەوە گەلی کورد لە سەردەمی عەبدولکەریم غەدرو زوڵمی لێ نەدەکرا، تعریب نەبوو، عەرەب و کورد جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو ، کەچی سەرۆك بارزانی و عەبدولکەریم قاسم بە ڕەنگاری یەکتربوونەوە کوشتنی (ئەحمد زێباری) بەڵگەو بیانوو بوو بۆ ئەوەی عەبدولکەریم قاسم لەگەڵ پارتی تێکی بدا. بە داخەوە شەڕ لە ١١/ ٩/ ١٩٦١ دەستی

پێکرد . هێشتا منداڵ بووم لە باسی کوردایەتی هیچم نەدەزانی کەچی ئێستاش هەر دەڵێم خۆزگە شەڕ لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم نەدەکرا، ئەو گێچەڵە تووشی کورد نەدەبوو .

بە بۆچونی من ئەوە بە یەکەمین هەنگاوی خراپ دانرا کە لیژنەی مەرکەزی پارتی هاوپشتی دەبوایە هەموو بارو دۆخەکانی هەڵسەنگاندایەو ئەنجامی شەڕەکەی لێك بدایەتەوە نەك لەبەر دڵ گەرمی چەند کەسێك گەلێك تووشی مەینەتو ماڵ وێرانی بکەن . ئاگرێك هەڵ بکەن خۆشیان تێدا بسووتێن، تاقی کردنەوەکانیش ڕاستی ڕووداوەکانیان ئاشکرا کرد .

کوردستان پێش شۆڕشی ئەیلول نەببوو بە مولگای سەربازی ، بە هەموو کوردستان واتە پارێزگاکانی (کەرکوك - موصل - سلێمانی - هەولێر) تەنیا یەك فرقە عسکەری لێبوو (فرقەی ٢) بارەگاکەشی لە کەرکوك بوو . زۆربەی هەرە زۆری پۆلیسو پاسەوانی شەوانو بەڕێوەبەری دەزگاکان کورد بوون ، زیانێکی گەورەش لە گەلی کورد کەوت بەوەی کە ڕێگایان خۆش کرد عەبدولکەریم قاسمو ڕژێمەکەی لەسەر دەستی بەعسیەکان بروخێو شەلو کوێرم بکەونە ناو کوردستان بە هەزاران ڕۆڵەی عێراقو گەلەکەمان بکوژنو بانگەوازی (غزا) بکەن لە کوردستان . ڕاستە عەبدولکەریم قاسم هەڵەو کەمو کوڕی هەبوو، بەڵام لەگەڵ هیچ ڕژێمێکی دوای ئەو بەراورد ناکرێ . بۆیە ئێستاش عێراقیەکان بە کوردو عەرەبەوە ئاخ بۆ ڕۆژانی عەبدولکەریم هەڵدەکێشن .

لە زستانی ٩٦٢ - ٩٦٣ دا پێشمەرگە بۆ یەکەمین جار هاتنە گوندەکەمان (دەربەندی گۆم) لە ناحیەی کەندیناوە بەچەتە ناسرابوون، دیارە ئەوان بەو وشەیە زۆر ناڕەحەت دەبوون، دەیان ووت یابڵێین کۆمەڵەیان پێشمەرگە بەبێ ئەوەی باسی ڕووداوێك بۆ خەڵکەکە شیبکەنەوە، بیرمە هەمیشە پارەیان کۆدەکردەوە بە خۆشیو بە ناخۆشی خوا هەڵناگرێت لە هەژارەکانیان وەرنەدەگرت . چەکەکانیان خراپ بوو تاك کلاشینکۆفیان هەبوو هەر ئەو شەوە دایان بەسەر گوندی سەربەشاخ (هادی ئەحمەد ئاغایان) پاش شەڕێکی کورت بەدیل گرتو لەگەڵ خۆیان بردیان لە پاشان لە ناوچەی بێتواتە کوشتیان .

لە ڕۆژی ٨/ ٢/ ١٩٦٣ دا بەعسیەکان انقلابیان کردو عەبدولکەریم قاسمیان کوشت پێم وایە پشووی نیوەی ساڵ بوو لە هەولێر بووم . دایکم لەگەڵ براکانم بوو، کە دەیان خوێند لە قۆناغی ناوەندی خانویەکی بچووکیان گرتبوو لە گەڕەکی سەیداوە شوعیەکان زۆربێ بەرنامە تەقەیان لە پۆلیسخانەی گەڕەکی سەیداوە کرد هیچیان بۆ نەکرا پشتیان دا، پاش چەند کاتژمێرێك هێزێکی گەورەی عسکەری هاتنە گەڕەکەکە زۆر بە دڕندە هاتنە بەرچاوم بە کۆڵانو

شەقامەکان بڵاوەیان کرد، ئەگەر بڵێم هەر پۆلیس‌و سەربازێك دارێکی بە دەستەوە گرتبێ ڕەنگە هەڵەم نەکردبێ . هەرچی بە کەڵکی گرتن هات بە لێدان بەرەو مەخفەرەکەیان برد . ئەوە یەکەمین دڕندەیی بەعس بوو کە لە یەکەمین ڕۆژی ئینقیلابەکەیان بەرامبەر گەڕەکی ئێمە کردیان . هەر چەند منداڵ بووم گرتن منی نەدەگرتەوە ، بەڵام هەموو کەسێك لە وەحش‌و دڕندە دەترسێ . بە ڕاستی گەڕەکی سەیداوە ئەو ڕۆژە تاریکی بەسەر هات‌و ئێستاش چەندین ساڵ بەسەر ئەو ڕوداوە تێدەپەڕێ، خەڵك ئەو ڕەش بگیریەی لەیاد نەچووە، ئەو دەمە منیشی ڕاچڵەکاند، هەژاندمی بیەم لێ دەکردەوە، باشە خەڵك گوناهی چیە بۆ وا بەدارو شەق‌و تێهەڵدان بدرێ، بۆ رێزی لێ نەگیرێ کێشەکەم بۆ ساغ نەدەبوەوە عەقڵم بڕی نەدەکرد .

هەموو کەسێك ناوی (حەرەس قەومی) بیستووە، کە زۆربەیان ئەندامەکانی حزبی بەعس بوون ئەوانی تریش، خوێڕی‌و سەرسەری شەقامەکان بوون، لەسەرانسەری عێراق بنکەیان دامەزراند چی خراپ بوو کردیان، کوشتن، بێ ڕێزی‌و بێ ناموسی، ئەتك کردن، تاڵان، جەردەیی، ڕاوەڕووت، تەخسیریان نەدەکرد ئێستا ئەگەر کەسێك ڕقی لەیەکێکی تر بێت چ پیاو و چ ژن کارێکی خراپ بکات دەڵێن (دەڵێی حەرەس قەومیە) .

بە هەر حاڵ گەڕامەوە گوندەکەی خۆمان ، هێزێکی گەورەی بەعسیەکان لە سەربازو حەرەس قەومی‌و هەندێ خۆفرۆش ، لە ١٣/ ٦/ ١٩٦٣دا هێرشیان کردە سەر گوندەکانی کەندیناوە لەو ڕۆژە (٢٥) گوندیان سووتاندو مەڕوماڵاتەکانیان بە تاڵان برد، تەڵقەیان لە پەنجەی ئافرەت دەکردەوە، ئاردو ڕۆن‌و شەکرو لێفەو جاجیان بار کرد هەرچی پارەو پوولێکی لە گیرفان بوو بردیان ، چوار کەسیان لە گوندی ئێمە شەهید کرد (حامدو کاك خدرو قادر، لەگەڵ پیرەژنێکی ٧٥ ساڵە)، ئەو ساڵە لەلای ئێمە بە ساڵی (فەرهود) بەناوبانگە .

خەڵکیان هێنایە سەر ساجی عەلی، زۆر کەسم دی نانی ژەمێکی نەبوو بیخوا، خەڵك دەربەدەرو ماڵ وێران‌و سەرگەردان بوو، لە گوندەکەی ئێمە (٥٠) پیاویان بە لێدان‌و کوتان بردو بۆ ماوەی (١٠) مانگ زیندانیان کردن ، لە ماڵی ئێمە سێ کەسیان برد باوکم‌و دوو برا(سیامەندو نیعمەت)، خەڵکی ئەو (٢٥) گوندە ڕوویان کردە هەولێرو گوندەکانی مرکیەو شەمامك بەڕاستی زۆر بە حورمەتەوە وەریان گرتن، هەرچی لە توانایان دابوو بۆ ئەو کوردە هەژار و لێقەوماوانە کردیان جگە لە دابینکردنی خواردەمەنی سووکە ماڵیشیان بۆ دانانەوە . پاش ماوەیەك عەشیرەتێکی عەرەبیان هێنایە ناوچەکەو نیشتەجێیان کردن . سەرۆکەکەیان ناوی (شێخ عەواس) بوو ئێستا کوڕەکانی لە حیمایەکانی سەدام حوسێنن، ماوەی سێ چوار ساڵ لە

ناوچەکە مانەوە لە زەمانی عەبدولرەحمان عارف عەرەبەکان ڕۆیشتن و خەڵکەکە زۆر بە مەمنونیش گەڕایەوە سەر خاکو نیشتمانەکەی خۆی . ماڵی ئێمەش وەکو ئەو خەڵکە ئاوارەو دەربەدەربوو، لە هەولێر ناویان لەو خەڵکەی ناوچەی کەندیناوە نابوو (مهاجیەکان).

لە ساڵی ١٩٦٥ لە پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم، زۆر هەژار بووینو بەرگیش پێوەمان دیاربوو، باوك و برا گەورەکەشمان گیرابوون لە (معتقل مسیب). مامۆستا زوبێر بیلال کە وانەی تەئریخی پێدەوتین داوای لێکردم کراسێك لەلای بەڕێوەبەری قوتابخانە وەربگرم، کە ساڵانە دەدرا قوتابیە هەژارەکان بە ناوی (معنوە الشتاء) زۆر بەزەییم بەخۆمدا دەهاتەوە، ئەو قسەم قبوول نەکرد. وتم ئێمە هەژار نین تەنیا گوندەکەمان سووتاوە، لێمان قەوماوە، دەمەویست بۆی بدرکێنم، کە لەسەر کورد وامان بەسەر هاتووە بۆم نەدەکرا، دیاربوو قسەی تری نەکرد، ئێستاش هەر سوپاسی ئەو هەستەی دەکەم، کە بەرامبەر قوتابیە هەژارەکان دەری بڕی .

هەر لە هاوینی ١٩٦٣ دا هێشتا بەعسیەکان هەر لەسەر حوکم بوون ئێوارەیەك چەند ئۆتۆمبیلێکی پڕ لە حەرەس قەومی هاتنە سەیداوە هێرشیان کردە سەر ماڵێك کە لە گەڕەکەکەمان زۆر بەناوبانگ بوون، هەمووممان گوێمان لە زیڕەو هاواری کچێکی ماڵەکە بوو، دیار بوو بێ حورمەتیان پێدەکرد ئەویش تەنیا بە زیڕەو هاوار نارەزایی خۆی دەردەبڕی، زۆرمان پێناخۆش بوو بەڵام هیچمان بۆمان نەکرا شتێك بکەین . بۆ بەیانی هەمووممان لەو کارەساتە تێگەیشتین پاش چەند ڕۆژێك ئەو کچە کوردە بەداخ و خەفەتەوە گیانی سپارد هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێت. ئێستاش ئەو کارەساتە برینێکی گەورەی لە دڵو دەروونی من دروست کردووە کە ڕەنگە سارێژ نەبێ چونکە نەمتوانی تۆڵەی ئەو کچەو سەدان، هەزار کەسی تر بە دڵی خۆم لە بەعسیەکانو خۆفرۆشان بکەمەوە، بەعسیەکان سەدان ، بگرە هەزاران تاوانی لەوەش خراپتریان کرد ناکرێ هەمووی لێرە بگێڕمەوە چونکە پێم وایە هەموو گەلی عێراق بە گشتیو گەلی کوردمان بە تایبەتی چاك ڕەوشتو کردەوەکانی بەعس ئەگێناسن .

ڕۆژی ڕووخانی بەعسیەکان لە ١٨/ ١١/ ١٩٦٣ دا بوو ڕۆژێکی خۆش بوو، بەڵام گۆڕانێکی ئەوتۆی لێنەکرا جگە لە نەمانی حەرەس قەومی، عبدالسلام عارف هەر بە سەرۆك کۆمار مایەوە، لە تاوانەکانی حەرەس قەومیەکان بەشدار بوو، ڕقیشی زۆر لە کورد بوو دەڵێن شەرمی بەوە دەکرد کە ڕاستو ڕاست بڵێ کورد ، بەڵکو لەجیاتی (کاکەڕەش و حەمە ڕەش)ی بەکار دەهێنا. بە دەیان کارەساتی دڵتەزێنی تریش کاری لە هەستو مێشکم کرد، بەرەوکوردایەتیو خەبات ڕایدە کێشام ، بیری تۆڵە کردنەوەی لە مێشك چەسپاندم، لە سەرەتای

ساڵی ١٩٦٦ کە لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووم لە قوتابخانەی کۆماری هەولێر بەهۆی کوڕەکانی سەیدی گرد عازەبان (زۆراب و حسام) چوومە ڕیزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان هەر ئەو ساڵ بە لایەنگیر وەرگیرام لە پارتی، زۆر بە دڵسۆزی کارەکانی سەرشانم ئەنجام دا بە دڵ پاکی سۆفیانە خزمەتی گەلەکەی خۆم دەکرد چەندین دۆستو لایەنگیرم بۆ یەکێتی قوتابیانو پارتی پەیدا کرد، بڵاوکراوەکانم دەخوێندەوە . بە دۆستو ئاشنایانم نیشان دەدا، بەرەبەرە لەڕووی تێگەیشتنەوەو بەرەوپێشەوە دەچووم، دۆخەکەش بە نەمانی عبدالسلام عارف هێمن تر بووە .

لە ڕادەبەدەر بارزانی نەمرم خۆش دەویست بە قیبلەی کوردانم دەزانی بە پیاوێکی بەرزو گەورەم دەزانی ، کە ناوی بارزانی دەهات کوردم بەبێ خاوەن نەدەزانی .

لە ٢٩/ ٦/ ١٩٦٦ عەبدولرەحمن بزاز بەیانێکی بڵاوکردەوە، کە گوایە لا مەرکەزی بۆ کوردستان دەسەلێنێ. لە بیرمە ناوی نهێنیم لە پارتی ڕەنجاو بوو لە لیژنەی هەڵمەت کارم دەکرد پالێوراو بووم بەڵام لەجیاتی ئەندامی لیژنەی هەڵمەت ئەرکەکانم جێ بەجێ دەکرد لێپرسراوەکەمان شەهید (سەعدی خەلیل) بوو، خوا لێ خۆش بوو مامۆستا عوسمان نۆغەرانی لە ناوچەی سەرپەرشتی دەکردین لە ڕادەبەدەر بارزانی نەمرم خۆش دەویست بە قیبلەی کوردانم دەزانی بە پیاوێکی بەرزو گەورەم دەزانی، کە ناوی بارزانی دەهات کوردم بەبێ خاوەن نەدەزانی.

لە ڕۆژی ١٤/ ٧/ ١٩٦٩ مەترسیم پەیدا کرد، کە لەلایەن ڕژێم ئاشکرا بووم لەگەڵ شەهیدی نەمر عەبدوڵڵا ڕەشید بەیەکەوە بڕیارمان دا بچینە ڕیزی پێشمەرگایەتی ئەو کات لقی دووی پ ـ د ـ ك بارەگای لە هیران بوو، مقدم عەزیز عەقراوی هەم لێپرسراوی لقی دوو بوو هەم فەرماندەی هێزی سەفینیش بوو چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە لە پاشان داوایان لەمن کرد، کە بگەڕێمەوە هەولێر بۆ ئەوەی بخوێنم وە پێیان وتم ئەمری گرتنت نیە بە کورتی بە وڵاتی کۆیەدا گەڕامەوە لە گوندی شاخە پیسکە لەوێ چاوم بە کاك عەلی هەژار کەوت .

لە شەوی ١٨- ١٩/ ٨/ ١٩٦٩ دا لە کاتژمێری (١٢)ی شەودا هێزێکی گەورەی سەربازی دەوری ماڵی ئێمەیان گرت ، داوای منیان کرد، پاش پشکنین دەست گیریان کردم ڕاستییەکەی هەندێ بەڵگەو بڵاوکراوەیان گرت بەڵام ئەفسەرەکە پیاوێکی زۆر باش بوو شاردیەوە ، بۆ بەیانیەکەی خستیانینە زیندانی فرقە ئەو کات فرقەی یەك لە هەولێر بوو ئامر فرقەکەش ناوی (عومەر هەزاع) بوو. سەیرم کرد چەند برادەرێکی تریش گیراون لەوانە : شەهید سەعدی خەلیل ـ کاك شاخەوان (محمد عباس) ـ ئیسماعیل حوسێن ـ عەلی مەحموود چوکل . پاشان بۆمان روون بوەوە کەیەکێك بە ناوی (ع. م) لە بری هەندێ پارە ناپاکی لەگەڵ کردینو ئێمەی تووشی

ئەو کێشەیە کرد ، بە سزای خۆی گەیشت . ئەو ئەفسەرە ئیستیخباراتە پیاوەتی زۆری لەگەڵ کردین بە ئاشکرا ئیفادەکانی دەگۆڕی ، هەموومانی بردە لای قائید فرقە داوای عەفوی بۆ کردین وە بە کەفالەت ئازادی کردین ئەو ئەفسەرە خۆی پێی وتین : ناوم (عبدالاله ئەحمەد)ە بۆ ئەوەی ناوەکەی بزانین‌و بشزانین کە ئەویش ڕزگاری کردوین ، دیاربوو هەر بەناو بەعسی بوو چونکە زۆر دژی بەعسیەکان دەجوولایەوە ، بەداخەوە ئێستا نازانم چی بەسەر هاتووە .

هەموومانیان هێنایەوە دائیرەی پۆلیس لە هەولێر بۆ ئەوەی کەفالەتەکەمان بۆ بکەن لە پڕ چەند سیخوڕێك هاتنە زیندان بۆ ئەوەی (صفحە اعمالمان) بۆ پڕ بکەنەوە سەیری ناوەکەی خۆم کرد بە قەڵەمێکی سوور ئیشارەت درابوو هەروەها ناوی شەهید سەعدی خەلیل سوور کرابوو ئێمەماینەوە لە زیندان. گوایە ئێمە زیاتر دژی میری کارمان کردووە. پاش واسیتەو رجاو تکا هەفتەیەك لەخۆڕا ماینەوە ، ئینجا بە کەفالەتێکی تر ئازاد کراین .

چەند جارێکی تریان گرتمەوە، جارێکیان لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەولێر کاك (عەلی رەسوڵ) لە ڕێگا گیرابوو دەیانویست بزانن ئێمە دەیناسین یان نا؟ بەڕاستی من نەمنەگیناسی هەندێکشیان ئازاردام چەند دوای ڕۆژێك پێش بلاوکردنەوەی بەیانی ١١/ ٣/ ١٩٧٠ ئازادیان کردم‌و هەموو زیندانەکانی تریشیان ئازاد کرد ، کاك عەلی رەسوڵ زۆر دۆست‌و ئازیزە یەکێکە لە تێکۆشەرانی گەلی کورد.

## بەیانی

## ١١ ی ئازاری ١٩٧٠

لە پاش نیوەڕۆی ١١/ ٣/ ١٩٧٠ بۆ هەموو کەسێك ڕوون بۆوە، کە ڕێکەوتن لەنێوان بەعس‌و سەرکردایەتی شۆڕش مۆر کراوە، ئیزگەی بەغداش ئاگاداریدا، کە لە کاتژمێری (٨)ی شەو بەیانێکی گرنگ هەیە، زۆربەی خەڵکی کوردستان شادو دڵخۆش بوون چونکە ماوەی نۆ ساڵ شەڕوپێکدادان زەرەرو زیانی زۆر بە خەڵك گەیاندبوو، کوشتن‌و بڕین، دەربەدەری‌و ماڵ سووتان‌و گرتنی هەڕەمەکی داننان بە مافەکانی گەلی کورد بڕێتەوە ، شتێکی کەمە نیە .

لە کاتژمێری (٨)ی شەو سەرۆك کۆمار خوا لێخۆشبوو (ئەحمەد حسەن بەکر) بەیانەکەی خوێندەوە بە ڕاستی خاڵی زۆر گرنگی تێدابوو، کە لەمێژ بوو گەلی کورد هەوڵی بەدەست هێنانی دەدا لەوانە : گۆڕینی ماددەی دەستوور، کە بەم شێوەیە دەستکاری کرا ( يتكون الشعب العراقي من القوميتين هي القومية العربية والقومية الكردية ). هەروەها بە فەرمی ناساندنی زمانی کوردیش لە پاڵ زمانی عەرەبیدا، ئازادکردنی هەموو بەندە سیاسیەکان، گەڕانەوەی باری سروشتی لە کوردستان، هەڵسوڕاندنی کاروبار لەلایەن کوردەوە لە ناوچە کورد نیشینەکان‌و گەلێ شتی بە نرختر .

ڕۆژانی ١٢/ ١٣/ ١٤ ـ دەزگاکانی میری لە هەموو شارەکاندا بوو بە پشوو ، کۆمەڵانی خەڵکی عێراق کردیان بە شایی‌و زەماوەند هەموو کەل‌و بەرێکی گرتەوە . لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕش لێبووردنی گشتی بۆ هەموو ئەو کسانە دەرچوو، کە چەندین ساڵە دژی ئامانجەکانی گەل وەستابوون . ئەو ئاهەنگانە (٢٠) ڕۆژی خایاندو هەموو شادی‌و خۆشیەکان لەلایەن جەماوەر خۆی ڕێك دەخرا . دیارە خەڵك ئەوەندە پەرۆشی ئازادی‌و سەربەستی دەکرد سنووری نەبوو . صدام حوسێن، ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەرۆك بارزانی‌و سەرکردایەتی شۆڕش گفتوگۆی کردو سەردانی ناوپردانیشی کرد . پارتی بڕیاریدا کە لە ڕۆژی نەورۆزی ئەو ساڵەدا خۆپیشاندانێك لە بەغدا ساز بکات بۆ ئەو مەبستە هەر لقێکی پارتی (١٠٠) ئەندامی بە جل و بەرگی کوردی ڕەوانەی بەغدا کرد، من ڕۆژی ٢٠/ ٧/ ١٩٧٠ گەیشتمە بەغدا دیارە هەر لقێك لە میوانخانەکانی بەغدا چەند ژوورێکی بۆ ئامادە کرابوو .

له ڕۆژی ٢١/ ٣/ ١٩٧٠ خۆپیشاندانێکی گەورە لە بەغدا سازکرا هەموو لقەکانی پارتی لەگەڵ کوردەکانی بەغدا بەتایبەتی قوتابیە کوردەکان بەشداریان تیاکرد. وێنەی سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی لە پێشەوە بوو ڕێکخراوەکانی بەعس بەشداری گەرمیان تیادا کرد زۆر جار دروشمی پارتی‌و بەعسی یەکی دەگرتەوە بۆ نموونە: ( اصبر اصبر یا دایان ـ جاك البكر والبارزان ) نیاز لەم ناوە وەزیری دیفاعی ئەو کاتی ئیسرائیل بوو . یان (موشي دایان یهددنا ـ ما یعرف ملا قائدنا) ئەو دروشمە لەلایەن بەعسیەکان بە تەنیا زۆر دەوترا (هەلهلي هەلهلي یا حبابة ـ پیشمەرگە یقابل دبابة) خەلکی بەغدا بە ڕێزی زۆرەوە پێشوازیان لەو خۆپێشاندانە کرد سەرۆك ئەحمەد حسەن البکرو صدام حوسێن‌و زۆربەی سەرکردەکانی بەعس لەگەڵ خوا لێخۆشبوو کاك ادریس‌و هەروەها بەڕێز کاك مسعوود بارزانی‌و هەندێ لە سەرکردەکانی پارتی هەمیشە لە پێشەوە پێش وازیان لەو خۆپیشاندانە دەکرد لە گۆڕەپانی تەحریر (د. مەحموود) ئەندامی م. س پارتی وتەیەکی خوێندەوە ، کە ئەحمەد حسەن البکر داوای کرد ، کە هەندێ لە ڕستەکانی دووبارە بکاتەوە بۆ نموونە د. مەحموود وتی : (من لێرە بە ناوی پارتی‌و سەرۆکەکەی ڕای دەگەیەنم  کە ئەو چەکەی هەتا دوێنێ لە سینگی یەکتریمان دەکرد ئەمڕۆ ڕووبەڕووی دوژمنی هاوبەشی دەکەینەوە) ئەحمەد حسەن البکر نصاً وتی  (بالله عید) واتا دووبارەی بکەرەوە لە ڕۆژی ٢٣/ ٣/ ١٩٧٠ گەڕاینەوە بەرەو هەولێر لە ڕێگا لەناو شاری کەرکوك ئەو (١٠٠) کەسە دابەزین دەستمان کرد بە هەڵپەڕکێ‌و گۆرانی، سروود وتن، دیاربوو ئەو کاتیش دەترساین کەرکوك بە کوردستان دانەنرێت بۆیە هەموومان بەیەك دەنگ هاوارمان کرد کەرکوك شاری کوردانە با لێی دەرچن بێگانە . ڕەنگە تورکمانەکان وشەی بێگانەیان بەخۆیان زانی بێ چونکە ئەو زەمان لەناو شاری کەرکوك زۆربەی هەرەزۆری گەڕەکەکان کورد بوون وەکو: (شۆڕیجە ـ ڕەحیماوە ـ تەپەی مەلا عەولا ـ ئازادی ـ ئیسکان ـ ئیمام قاسم) وە ڕەنگە چەند هەزار ماڵە تورکمانێکی لێ بووبێ . بە دەگمەن عەگال‌و کراس شۆڕی عەرەبەکان بەر چاو دەکەوت. ڕاستە گوندەکەی ئێمە سەر بە پارێزگای هەولێر بوو ڕێگای کەندیناوە کەرکووك بە هۆی بوونی نەوت قیرتاو بوو هەر لە منداڵیەوە هاتوچوومان بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی ژیان، بە ساغ کردنەوەی ماست و پەنیر، یا فرۆشتنی گەنم... هتد لەسەر کەرکوك بوو . بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە خودی شاری کەرکوکدا هەموو ماڵە عەرەبەکان نەدەگەیشتنە (٢٠٠) ماڵ، کە (١٠٠) سەد ماڵیان (حەدیدی) بوون زۆربەیان لەجیاتی تەکسی بە عارەبانە خەڵکیان دەگواستەوە لە گەڕەکێك بۆ گەڕەکێکی تر ، تورکمانەکانیش ئەوانەی بە تورکی قسەیان دەکرد

مەرج نەبوو تورکمان بن بەڵام بارو دۆخ گۆڕانی بەسەردا هێنابوون لە چەند گەڕەکێك بە برایانە لەگەڵ کورد پێکەوە دەژیان وەکو (پیرباد شاترلو ـ قوریە ـ تسعین) گەڕەکی عەرەبیش زۆربەیان ئاسووری بوون لەگەڵ هەندێ کورد. قەزای دبس هەمووی دە ماڵە عەرەبی لێ نەبوو، کە ئێستا لە سەدا هەشتای عەرەبن کوردەکانیان لە شوێن و جێگای خۆیان دەرپەڕاند . جگە لە حەویجە هیچ قەزاو ناحیەکی تر عەرەب نەبوون، کەواتە مەترسیەکەی ساڵی ١٩٧٠ لەجێی خۆی بوو چونکە ئەوەی بیرمان لێدەکردەوە وا بە چاوی خۆمان دیمان .



## بۆچی بەعسیەکان بەیانی ئازاریان مۆرکرد ؟

له ٧ /٧/١٩٦٨ بەعسیەکان بە پشتیوانی چەند ئەفسەرێکی گەورەی سوپا کە دەسەڵاتداربوون لە رژێمەکەی عەبدولرەحمن عارف بەبێ خوێن رێشتن‌و تەق‌و تۆق هاتنە سەر حوکم :

١. عەبدولرەزاق نایف مدیر ئیستیخبارات .
٢. عەبدولرەحمان داود ئامر حەرەس جمهوری .
٣. سەعدون غیدان ئامر کتیبەی دەبابەی حەرەس جمهوری .
٤. حەمادی شەهاب ئامر لوای (١٠) مودەرەع .
٥. چەندین ئەفسەری پلەداری تر .

له ٣٠ تەموزی هەمان ساڵ عەبدولرەزاق نایف‌و عەبدەولرەحمان داودیان شەق تێهەڵداو دەریان کردن . شۆڕشی کوردیش بە هێزو توانا بوو، ئێران لەبەر هەندێ بەرژەوەندی خۆی لە خەلیج‌و کێشەی شط العرب دەیویست عێراق ناچار بکات مل بۆ داواکانی کەچ بکات . بەعسیەکان خۆیان زۆر بە پێشکەوتن خواز دەزانی وایان لە مێشکی خەڵك دەگەیاند، کە تومەتی عەرەب رزگار دەکەن، ئیسرائیل دەشکێنن، ئەمیرو مەلیکە عەرەبەکان مایەی نەگبەتی عەرەبن پێویستە نەمێنن، لەگەڵ سۆڤیەت ئەو دەوروپشتەی سۆڤیەت پەیوەندیان چاك کرد، ئیعتیرافیان بە ئەڵمانیای شەرقی کرد، دەیان گوت پشتیوانی شۆڕشی رزگاری خوازی گەلان دەکەین، لەباتی ڤێتنام‌و کمبۆدیاو لاوس‌و زفار هەر شین‌و گریانیان بوو بۆ فەڵستین، هەر چەندە بە کردەوە لە پاشان سەلماندیان، کە هیچیان نەکرد بۆ فەڵستینیەکان اصلاح زراعیەکی نوێیان دەست پێکرد بەهەر حاڵاً لە ناوخۆشیان چەند جەماعەتێك بوون، دەیان ویست لە فرسەتێکی هەڵکەوتو باش لایەك لایەکی تر دەربەرێنن . حردان عەبدولغەفار التکریتی‌و صالح مەهدی عەماش هەر یەکە بۆخۆیان شتێك بوون، ئەوەندەش دەوڵەمەند نەبوون بتوانن وا زوو خۆیان بەهێز بکەن، چونکە نرخی نەوت ئەو کات ئەوەندە زۆر نەبوو، هۆیەکی تری مۆرکردنی بەیانەکە راکێشانی رای دنیای دەرەوە بۆ لای خۆیان تا بە پێش کەوتن خوازو دیموکراتیان بزانن. زەبر لێدان لەبەر هەڵستکاری عێراقی بە گشتی‌و ئەفسەرە گەورەکانی ناو سوپا بە تایبەتی یەکێکی تر بوو، کە جارێ شەڕ لەگەڵ کورد رابگرن.

چەشە خۆرکردنی لێپرسراوانی شۆڕش بە پارەو ئۆتۆمبیل‌و قۆنتەرات تاکو بیریان بەلای شۆڕشەوە نەمینێ زیاتر بیر لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکەنەوە ، خالێکی تر لە هۆیەکانی مۆرکردنی بەیانی ئازار، تێکدانی پەیوەندی نێوان شاو سەرکردایەتی شۆڕش‌و ئامادەکردنی سوپایەکی بەهێزو کڕینی چەك‌و کەرەستە هۆیەکی تری گرنگی مۆرکردنی بەیانی ئازار دەگرێتەوە خۆی . پاش ماوەیەکی کورت ڕووداوەکان ئەو ڕاستیانەی بە چاکی سەلاند . یەکەم جار تەقەیان لە بارەگای پارتی کرد لە موسڵ ئینجا تەقەیان لە سەیارەی خوالێ خۆشبوو ئدریس بارزانی کرد، کە کاك حەمید بەرواری بە سەختی بریندار بوو . پیلانیان بۆ شەهید کردنی سەرۆك بارزانی ڕێك خست ، کە بە سەرسوڕمانەوە گیانی ڕزگار بوو، بەرە بەرە کوردیان لە خانەقین ـ کەرکوك ـ سنجار ـ زمار ـ تەلەعفەرو چەند شوێنێکی تر دەرکرد عەرەبیان بە لێشاو بە هەزار بیانوی نابەجێ دەخزاندە کوردستان، چەند عەشیرەتێکی کوردیان لە شۆڕش هەڵگەڕاندەوە چەندین کوردی دڵسۆزیان شەهید کردو لاشەکانیان لەسەر شەقامەکان فڕێدا ڕاستیشە هەندێ بەندییان لە بەیانەکە بەنیوە چڵی جێبەجێ کرد وەکو دانانی کورد بە : محافظ ـ مدیر شرطة ـ سەرۆك دائیرەکان لە شارەکانی هەولێر سلێمانی ـ دهۆك‌و قەزاو ناحیەکان بەڵام هەرگیز دەزگای ئەمنیان بە کورد نەدەدا . لە سوپاش هیچ فەرماندەیەك یا سەرکردەیەك بە ناوی کورد نەبوو بەڵکو وەزیر دیفاع ـ ڕەئیس ئەرکان ـ معاون ڕەئیس ئەرکان ـ مدیر ئیستیخبارات ـ قائد فەیلەق‌و فرقە هەموویان لە بەعسیە هەرە شوفینیەکان بوون، پێنج ئەندامی پارتی بە وەزیر ناونوس کرابوون، کە هیچیان دەورو کاریگەریەکی ئەوتۆیان لەسەر سیاسەتی عێراق نەبوو . وەزارەتە بێ ئەهەمیەتەکانیان دابووە کورد .

مجلس قیادة الثورة سیاسەتی عێراقی ئاراستە دەکرد، کە هیچ نوێنەری کوردی تیا نەبوو، بڕیار بوو جێگری سەرۆك کۆمار کوردێکی دڵسۆزبێ بەڵام هەر باسیشی لێنەدەکرا. هەر چەندە جێگری سەرۆك کۆمار هیچ دەسەڵاتێکی نیە چونکە بەگوێرەی بڕیاری مجلس قیادة الثورة لە کاتی مردنی یا ئامادە نەبوونی سەرۆك کۆمار جێگری سەرۆکی مجلس قیادة الثورة جێگای دەگرتەوە .

لەو هەموو دۆخە ئاڵۆزو پڕ لە گرێ‌و دژوارە هەقە بزانین سەرکردایەتی پارتی هەڵوێستیان چی بوو، چیان دەکرد، هەڵسوکەوتیان چۆن بوو ..!

## سەرکردایەتی شۆڕش لەکاتی مفاوەزات

پێش هەموو شتێك هەقە ئەوە بزانین، کە سەرکردایەتی شۆڕش لە چەند کەس پێك هاتبوو، ئەوانە کێ بوون! لە تەمووزی ١٩٧٠ پارتی دیموکراتی کوردستان کۆنگرەی هەشتەمی لەناو پردان بەست بە ئامادەبوونی (٥٠٠) کەس وە زۆر لە میوانانی دەرەوەو ناوەوەی عێراق بەشداریان کرد دیارە دۆخی ئەو کاتی هەڵسەنگاندوەو باسی بارودۆخی دنیاو دەوروپشتی کردووە سەرکردایەتیەکی نوێی هەڵبژارد لەو هەڤاڵنە :

١. حەبیب محەمەد کەریم (سکرتێری پارتی) .
٢. د. مەحموود عوسمان (م. س).
٣. نووری شاوەیس (م. س).
٤. عەلی عەبدوڵلا (م. س).
٥. شەهید سالح یوسفی (م. س).
٦. محەمەد مەحموود عەبدولرەحمان (سامی) (م. س).
٧. موقەدەم عەزیز عەقراوی (م. س).
٨. خوالێخۆشبوو ئدریس بارزانی .
٩. مەسعوود بارزانی .
١٠. فاخر حەمەد ئاغا مێرگەسۆری .
١١. فارس حەمەد باوە .
١٢. دارا تۆفیق .
١٣. سدیق افندی .
١٤. عەبدل سۆران .
١٥. عەلی سنجاری .
١٦. شەکیب عەقراوی .
١٧. ڕەشید سندی .
١٨. عەبدولوەهاب ئەتروشی .
١٩. هاشم عەقراوی .
٢٠. مەلا ئیسماعیل مەلا عەزیز .
٢١. زەکیە ئیسماعیل حەقی .

**وەزیرەکان بریتی بوون لە :**

١. خ ل نوری شاوەیس وەزیری ئیشغال‌و ئیسکان .

٢. خوالێخۆشبوو نافز جەلال وەزیری الزراعە .

٣. بەرێز ئیحسان شێرزاد وەزیری بەلەدیات .

٤. شەهید سالح یوسف وەزیری دەوڵەت‌و ئەندامی لیژنەی سلمی عێراقیش بوو .

٥. محمد مەحموود سامی وەزیر اعمال الشمال .

٦. بەرێزان عەلی عەبدوڵلاو عەبدولوەهاب ئەتروشی لەگەڵ هاشم عەقراوی پارێزگاری هەولێرو سلێمانی‌و دهۆك بوون .

هەر چەندە محافظ و مودیر شرطەو بەڕێوەبەرایەتی شارەکان زۆربەیان بە دەست کوردە دڵسۆزەکان بوون بەڵام فەرماندەی هێزەکان ئامر بەتالیۆنەکان، سەر لقەکان، هەتا هەندێك لەسەر پەلەکانیش هەریەکە لە سنووری هێزەکەو ناوچەکەی سەربەخۆ کاریان دەکرد گوێڕایەڵی فەرمانی میری شارەکان نەبوون .

چونکە داخی گرانم هەر جارێ کورد فرسەتێکی باشی دەستکەوێ پێشمەرگەکان پشت گوێ دەخاو سوود لەو هەلە وەرناگرێ تا فێری نظام و ڕاهێنانیان بکات وا دەزانێ جارێکی تر پێویستی بە پێشمەرگە نامینێ . لە پەنا چەسپاندنی قانون هەموو ئەو تێکۆشەرانە پشت گوێ دەخا، کە لە ناخۆشترین کاتدا لەگەڵ مەسەلەی گەلەکەیاندا بوون، وەهیچ جارێکیش ئەو پشت گوێ خستنە بە قازانج نەگەڕاوەتەوە هەر بۆیەش ئاڵۆزی دەکەوێتە ناو شارەکان‌و کەس وەرەقەی کەس ناخوێنێتەوە من پێم وایە تێکۆشەرانی ناو سەنگەر باشتر قانون دەچەسپێنن لەوەی، کە پیاوێکی هەلپەرست دەیکا چونکە بۆ مانەوەی خۆی هەزار قانون دەگۆڕێ بەهەر حاڵ ..!؟ چەند مانگێك بەسەر مۆرکردنی بەیانی ئازار تێپەڕی بەرە بەرە لێپرسراوانی شۆڕش بڕواو متمانەی خەڵکیان لە دەستدا، زۆربەیان کەوتنە سەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە جیاتی ئەوەی هەموو هێزو توانای خۆیان تەرخان بکەن بۆ خزمەت کردن ئەو زەرەرو زیانانەی، کە لە ڕابردوو لە کوردستان کەوتبوو پڕی بکەنەوە، کەچی بە پێچەوانەوە زۆربەیان کەوتنە کارکردن بۆ پڕکردنی گیرفانی خۆیان بە ڕێگەی نا شەرعی، هەندێکیان بوون بە قۆنتەرات چی، سەیارەی مارسیدیسیان لە کوێت دەهێنا بە پارەیەکی هەرزان، حوکمەت بڕیاری دابوو، کە هەموو ئەو خانووانەی لە شەڕدا سووتاون چاکیان بکاتەوە، هەندێك لە کاربەدەستانی شۆڕش پارەکەیان وەرگرت‌و هەندێکی بەنیوەچڵی دروستکراو پارەکەی تریان بۆخۆیان خەرج دەکرد.. بەهۆی

شۆڕش‌و باری نائاسایی کوردستان زۆربەی گوندەکان بێ قوتابخانەو نەخۆشخانە بوون کەکاتێ بڕیار دەدرا قوتابخانەیەك بۆ گوندێ دروستبکرێ هەر زوو لێپرسراوانی شۆڕش قۆنتەراتەکەیان دەگرت، قوتابخانەیەکی بێ سەروبەریان دروست دەکرد، لێپرسراوانی پەروەردەو موهەندیسەکانیش لەبەر ئەوەی بێ دەسەلات بوون، چەکدار نەبوون، هەڕەشەیان لێدەکرا دەبوایە زۆر بە باشیش وەری بگرن دیارە ئەو جۆرە کسانە هیچ بەتەنگ منالانی کوردەوە نین . بیریان لەوە نەدەکردەوە گرنگی قوتابخانە چییە ..! پێویست ناکات من دوورو درێژی بکەمەوە گەلەکەمان چاك ئەو جۆرە کسانە ئەگیناسن من هەر ئەوەندە دەلێم ڕزگارکردنی کورد تێکۆشەری ڕاستەقینەی گەرەکە .

پێویستە بە ڕاشکاوی ئەو ڕاستیەش ڕوون بکەمەوە کە میللەتی کورد ئێمە لەو دۆخە ئالۆزەش بڕوای تەواوی بە سەرۆك بارزانی هەبوو وەکو دەگێڕنەوە هەموو ئەو کارانەی دەزانی بەلام ئەوەندە فراوان ببوو چارەسەرکردنی زۆر ئاستەنگ بوو پێم وایە ئەگەر چاوی بارزانی دیار نەبوایە ئەو جۆرە لێپرسراوانە میللەتەکەیان دەخواردو بۆی دەردەچوون، چۆن هەندێکیان وەکو بەرزەکی یاتان بۆی دەرچوون ؟ خوالێخۆشبوو بارزانی نەمر چەندین لێپرسراوی لەکار خست بەلام داخی گرانم یەکگرتنی دزەکان زۆر بەهێز بوو . چوار سالێ مفاوەزات هەلێکی لەبار بوو بۆ ڕێکخستنی پێشمەرگەو ئامادەکردنی بۆ ڕۆژێکی پێویست لە ڕووی فکریەوە وشیاریان بکەنەوە، مەشقی باشیان پێ بکەن، حالو گوزەرانیان چاك بکەن، کەچی بە پێچەوانەوە هەرگوێشیان بە پێشمەرگە نەدەدا . هەر بۆیەش پاش کۆتایی مفاوەزات پێشمەرگە گیانی شەڕکردنی بەهێز نەبوو چونکە دەیزانی چی لێکراوە لە ڕۆژانی خۆشی . زۆربەی پێشمەرگەکان ساڵدانە ساڵدانە لە شەقامەکان دەسوڕانەوە، هەر خەریکی جادە پێوان بوون، بێئەوەی هیچ کسێك لێیان بپرسێتەوە، یارمەتی مانگانەشیان پێنج دینار بوو بەهەق پێشمەرگەکان دلسۆزو قارەمان بوون سەرەڕای ئەو زولمەی لێیان دەکرا . لە ڕۆژی تەنگانە لە ڕیزەکانی هەرە پێشەوە دەجەنگان . دەبێ ئەو قسەیەش ڕاست بێ دەلێن :

شۆڕش پیاوی ژیرو زانا بناغەی دادەنێ‌و پیاوی ئازاو مەردیش دەیگەیێنێتە سەرو پیاوی ترسنوك‌و هەلپەرست‌و ماستاوکەریش دەیخوا .!؟ بە فەرمی (١٢) فەوجی حەرەس حدود بۆ پێشمەرگەکان کرایەوە یارمەتی‌و مخصصاتی فەوجی حەرەس حدودی عێراقیان وەردەگرت ،

بەداخەوە ئامر فەوجە چەنەبازەکانیان هیچ گرنگیەکیان پێنەدا تەنیا بۆ موچە وەرگرتن دەچوون بۆ مەعەسکەر لە شارەکانی کوردستان یاساو ڕێکخستن وەکو پێویست نەبوو لەبەر بێ

دەسەڵاتی . لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٢ مەترسی بەرە بەرە پەیدا دەبوو . هەر دوولا دووره پەرێز بوون، سەرکردایەتی شۆڕش بەگوێرەی بەیانی ئازار دەبوایە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئێران ببڕێ کەچی بە دزییەوە پەیوەندی بەهێزتر دەکرد، گەڵاڵە وەکو بازاڕێکی ئێرانی مامەڵەی لێدەکرا، هەر چەند ڕێگای حاجی ئۆمەران ـ هەولێر ـ بەغدا لەسەر پشت بوو بۆ هەموو کەسێك کەچی بازاڕەکان لەگەڵ بازاڕی ئێران پەیوەندیان هەبوو . هەندێك لە لێپرسراوانی شۆڕش مەترسی گرتنیان هەبوو لە حوکمەت . پیلان گێڕان لە بارزانی نەمر ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ کەم کردنەوەی بڕوا بە یەکتر حوکومەتی عێراق هەموو جۆرە حزبایەتیەکی لە ڕێزەکانی سوپا قەدەغە کرد تەنیا بەعسی نەبێت ، ڕۆڵی پارتیان لەناو سوپا کەم کردەوە . ئەندامانی پارتیان خستە بەر هێرش‌و پەلامار، سیاسەتی تەعریب لە ناوچەی زمارو تەلەعفەرو کەرکوك‌و خانەقین بەردەوام بوو عێراق لەڕووی سەربازی خۆی بەهێز کردبوو، پەیوەندیەکانی دەرەوەی باش کردبوو . لە ٣٠/ ٧/ ١٩٧٢ لێپرسراوی پارتیان لە مەعسکەری هەولێر گرت ، ئەو کات سەرباز بووم لە کەتیبەی (٦)ی مەدفەعی لێپرسراوەکە خەڵکی سلێمانی‌و ناوی نائب ضابط مستەفا بوو ، وای گێڕایەوە ئەگەر چارەیەکی نەکەین دەیکوژن ، لەگەڵ چەند برادەرێك گفتوگۆمان کردو قسەمان لەگەڵ خۆی کرد، بەبێ ئەوەی پرسی پارتی بکەین بڕیارماندا ڕزگاری بکەین، من دەوریە بووم لەگەڵ چەند برادەرێکی هەولێر، پێشتر بەیەکەوە لە قوتابخانە بووین پاسەوانی مەشجەب‌و سجن بووین بە تەکبیری هەموومان کاك سلێمان عەولا دەرگای کردەوە، ئێمەش ئامادە بووین بەچەکەوە ئەگەر پێویستی کرد یارمەتیان بدەین بە هەر حاڵ ڕزگار بوو، ئەو ڕۆژە بە ئاستەنگ توانیم لە سەربازخانە خۆم ڕزگار بکەم چونکە چەند کوڕی باشێك بە درێژی بە ئامرەکەیان ڕاگەیاندبوو، کە مەسەلەکە چۆنە ..! بەناچاری خۆم گەیاندە ناو شار لەوێش پاش چەند ڕۆژێك گەیشتمە ناوپردان، کە بارەگای مەکتەبی سیاسی‌و عەسکەری لێبوو، ئێمە کارێکی وامان نەکردبوو کە هەندێ لە لێپرسراوانی شۆڕش پێ خۆش حاڵ بن کاك عەولا ئاغای پشدەری ئامر هێزی باڵەك‌و ئەندامی مەکتەبی عەسکەری هەڕەشەی لێکردین بە زەقی وتی : (ئێوە بەیانی ئازار تێك دەدەن) زۆر دڵگیر بووم، بەڵام هەرگیز پەشیمان نیم چونکە توانیم لە ڕزگارکردنی گیانی مرۆڤێك بەشداری بکەم ، مام مستەفای نائب ضابط زۆر تێك چوو وتی : لەسەر من چیتان بەسەر هات ..! وتی : هەرچی پارەم هەیە دەیدەم بە ئێوە زۆر دەوڵەمەندم .. ئێمە وتمان : عەیبە قسەی وادەکەی ئەگەر لێرە هەر چییەکمان بەسەر بێ لەسەر کورد دژی بەعس کردوومانە دەچینە بارەگای بارزانی ، باشم لەبیرمە تەنیا یەك دینارێشمان لە

مام مستەفا وەرنەگرت . کاك عەولا ئاغا دەیویست هەموو عەیبو عارەکان بە ئێمە داپۆشێ، کە هەرگیز دانەپۆشرا تێگەیشتم لە مەسەلەکە بەلام (این المفر) دیار بوو ئەو بە لەهجەی قەلادزەییانە بەردەوام بوو لە هەرەشەو گورەشە خواو ڕاستان بەیانی کاك ڕەشید سندی کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو هاتەوە پێم وایە لە سەفەری بارزان بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی شێخ محەمەد خالیدو خوالێخۆشبوو شێخ عوسمان . کاك ڕەشید سندی زۆر بەرێزەوە وەری گرتینەوە نەقلەکەم بۆ باس کرد، بیروڕای عەولا ئاغاشم پێ وت دیار بوو لە قسەکانم تێگەیشت سەرێکی ڕاوەشاندو ورتەیەکی لێوەهات نەمزانی چی وت وای بۆ دەچم نارەزایی دەربڕی ناوی نووسین خەرجی پێدایین، داوای لێکردین بچین بۆ لای کاك ئیدریس بارزانی، ڕازی بووین بۆ بەیانی بەرەو حاجی ئۆمەران ڕۆیشتین ، بارەگای بارزانی هاوینان لەوێ بوو . نامەی کاك ڕەشید سندیمان لابوو لە هیچ شوێنێك نەیان گێڕاینەوە بە قسەکردن کاك ئیدریسم بۆ یەکەمین جار بینی . ڕۆح سووك بوو سۆزانی باش دەزانی بۆ کارەکەمان ڕێزو سوپاسی کردین، سەرو چەکی برنەوی بۆ نووسین، کە بچین لەلای کاك ئەحمەد حاجی وەری بگرین، ئەویش هەریەکە (١٥) دیناری بۆ خەرج کردین ئەو کات زۆر زۆر بوو، کاك ئیدریس پێی وتین : کارێکی یەکجار مەردانەتان کرد هەر کاتێك کارێکتان هەبوو وەرنە لام، لەوحەدو سەدە بەرە بەرە ئەندامانی پارتی لە ڕێزەکانی سوپای عێراق هاتنە دەرەوە پەیوەندیان کردەوە . چووینەوە لای کاك ڕەشید سندی برادەرەکانم داوای هێزی دەشتی هەولێریان کرد ، کاك ڕەشید سندی داوای کرد کە لە بارەگای مەکتەبی عەسکەری بمێنمەوە لەبەر خوێندەواری بۆ سەر دژە ئاسمانیەکان من بە تەنیا بە داواکەی ڕازی بووم ، گواستمیەوە بۆ لقی دژە ئاسمانیەکان لەوێ دەستمان بە مەشق کردن کرد لەسەر ٢٠ ملم، ٣٠ملم ـ ٦٠ ملم، دۆشکە کە هەمویان چەکی دژە ئاسمانین پاش دوو مانگ ناردیان بە شوێنمدا کە ببم بە کاتب لە مەکتەبی عەسکەری زۆرم پێناخۆش بوو چونکە لەگەڵ پێشمەرگەی مقەرەکەمان زۆر ئاشنایەتیم پەیدا کردبوو، ڕێزیان دەگرتم ئەوان زۆربەیان خەڵکی ناوچەی باڵەك بوون عەلی ئاغا محەمەد مەحموود شەیتان، خدر سۆفی عومەر، ئەحمەد ئالی ڕەئیس عەرەفا محەمەد (خەڵکی بەرواری باڵا) سەر لقەکەمان ناوی ئەبو تالیب بوو بەڕاستی بەجێ هێشتنی ئەو برادەرانەم زۆر لا ناخۆش بوو بەلام زۆریان لێکردم بە ناچاری هاتمەوە مەکتەبی عەسکەری لە بەشی دارایی بووم بە نووسەر کۆنە مقەرەکەمان نزیك بوو لە مەکتەبی عەسکەری ، هەفتەی دوو جار سەرم لە برادەرەکانم دەدایەوە . ئێستا دۆستایەتیو برایەتیم لەگەڵ ئەوانو خزمەکانیان بەهێزە . بە هۆی نزیك بوونم لە دامودەزگاکانی شۆڕش لە

باروودۆخی دنیا پتر شارەزاییم پەیدا کرد. پاش ماوەیەك لە مەکتەبی سیاسی داوایان لێکردم یارمەتیان بدەم بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌وکاری خێزانی شەهیدان بە سوپاسەوە یارمەتیم دەدان زۆر کەس‌وکاروو خێزانی شەهیدان هاتنە لامان دەستیان کورت بوو داوای یارمەتیان دەکرد، داوای ئەوەیان دەکرد بەڵکو کاری خانەنشینیان زوو بۆ بکرێ لەو ماوەیەی، کە کارم بۆ کردن بڕوا تاکەم دڵی کەسم شکاندبێ وە بەگوێرەی توانا یارمەتیم دەدان . ئەو لێپرسراوانەی، کە کارم لەگەڵ کردوون زۆر ڕێزیان دەگرتم تا شۆڕش تێك چوو لەوێ بووم بنکەی سەرکردایەتی لە ناوچەی باڵەك بوو زۆر ئاشنایی‌و دۆستایەتیم پەیدا کرد چوومە بنج‌و بنەوانی ژیانیان، خەڵکی باڵەك ڕێزی خەڵکی غەریب زۆر دەگرن، بە ماندوبونی خۆیان دەژین چاویان لە غەدرکردن نیە دەیان ڕۆڵەی ئازاو چاونەترسیان لە پێناوی سەرفرازی گەل شەهید بووە، لە ئابی ۱۹۷۳ دا چوومە دەورەی کادیران لەناو پردان لە کاتژمێر ۳ — ۸ ی ئێوارە بوو، ئیش‌وکارەکانی خۆشم لە بارەگا ئەنجام دەدا، چوار مانگ لە خولەکە ماینەوە زۆر دەرسی بەکەڵك فێربووین (قاموسي سياسي - شۆڕشی گەلان - شۆڕشەکانی کورد - الحرب النفسية - پاراستن - پەیڕەو و پرۆگرامی پارتی - لاتینی فێربوون - العلاقات الدولية - الحياة الاجتماعية... هتد). خولەکەمان تەواو نەکردبوو(عەزیز عەقراوی‌و هاشم عەقراوی‌و مەلا ئیسماعیل مەلا عەزیز) چونەوە ناو حکومەت بەرە بەرە دۆخەکە لەگەڵ حکومەت بەرەو خراپتر دەڕۆیشت، وەزیرەکان‌و لیژنەی مەرکەزی پارتی دەهاتن‌و کۆدەبوونەوە لەساڵی ۱۹۷۳ شەهید کەمال جنبلاط هاتە لای بارزانی خەڵك پێشوازی لێکرد، وە دەیانگوت کوردە شتێك دەکات . سەرۆك بارزانی زۆر ڕێزی لێگرت لە گەڕانەوە کاك ئیدریس لەگەڵی ڕۆیشت تا پەڕییەوە .

چەند جارێك بە هەلیکۆپتەر بەڕێز عەزیز شەریف دەهات پێشنیارەکانی حکومەتی دەهێناو هی پارتی دەبردەوە پیاوێکی بەتەمەن بوو زۆر باسی کارە چاکەکانی دەکرا . جارێکیش غانم عەبدولجەلیل هات کە بەڕێوەبەری نوسینگەی سەدام بوو .

لە خولی کادیراندا بە پلەیەکی باش دەرچووم ، کاك مەسعود بارزانی‌و کاك حەبیب‌و کاك د. مەحموودو کاك شەکیب لە ئاهەنگی دەرچوانی کادیرەکاندا ئامادەبوون .

کاك مەسعوود داوای لێکردین، کە بچینە خزمەت سەرۆك بارزانی زۆر زۆرمان پێ خۆش بوو ، من بارزانیم لە دوورەوە بینی بوو ، ئەو کاتەی کە دەهاتە ناوپردان بۆ سەردانی (لالە حەمە) لە نەخۆشخانە .

خۆمان ڕێك خستو ئامادە بووین ، كڵاو جامانەمان لەسەر كرد لەگەڵ كاك مەهدی عەزیز خۆشناو، كە هەردەم لەناو پردان بەیەكەوە بووین برادەرێكی ئازیزو دڵسۆز بوو ئەو ڕۆژە هەر بەیەكەوە باسی بارزانیمان دەكرد . شەو گەیشتینە قەسرێ لە كۆتایی ڕۆژەكانی ساڵی ١٩٧٣ بوو. چووینە لای كاك مەسعود لەوێ كاك فرەنسۆ حەریری لەگەڵمان هاتو دە كادیر بەیەكەوە دەچووینە ژوورەوە . بارزانی نەمر زۆر بە گەرمی یەكە یەكە پێشوازی لێكردین ، دەستمانی گوشی، دانیشتین، قسەی بۆ كردین ئەو قسەی دەكردو ئێمەش هەر سەیرمان دەكرد، هیچی پێوە دیار نەبوو، خەنجەرەكەی لەناو پشتێنەكەی دانابوو، كلاشینكۆفەكەیم نەبینی بەلاَم مەخزەنەكانی بەستبوو، خاوێنو ڕێكو پێك بوو، وەكو ئێمە بە سۆرانی قسەی دەكرد لە وشەی مەكتەبی سیاسی جیاوازیم پێدەكرد، ئەو دەی فەرموو : مەكتەبا سیاسی ، لە قەسری شێخ بابۆ چووینە خزمەتی، ڕەشید عارفو د. جەمیلو فرانسۆ لەوێ بوون .

بارزانی فەرمووی مورتەزا حەدیسی هاتە لام وتی: ئەگەر باسی كەركوك دەكەی ئەوە فەرموو بۆ دەرەوە . هەروەها لەبارەی كەركوك فەرمووی : حكومەتی عێراق دەیەوێ من ئیمزا بكەم كەركوك كورد نیە، ئەوە بەهیچ شێوەیەك نایكەم چونكە منالەكانی ئێوە پاش پەنجا ساڵی تر دەڵێن: بارزانی كەركوكی فرۆشت . بەڵێ بارزانی ڕەمزی كوردایەتی بە درێژی باسی ئەركەكانی كادیری بۆ كردین . پاش كۆتایی چاوپێكەوتن بە دڵخۆشی گەڕاینەوە شوێنی خۆمان .

## کۆتایی مفاوەزات

لە ماوەی چوار ساڵ شەڕ ڕاگرتن ڕژێمی عێراق خۆی بەهێز کردەوە، پەیوەندیەکانی دەرەوەی پەرەپێدا، شیوعیەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، چەكو تەقەمەنی بەسەر دابەش کردن خستینیە ناو بەرەی نیشتیمانی، لەگەڵ پارتی بەگژ یەکتریدا کردن، چەند ئەندامێکی وەکو : عەزیز عەقراوی، هاشم عەقراوی، مەلا ئیسماعیل مەلا عەزیزی لە شۆڕش کردەوە، بەناوی پ. د. ك. پشتگیری لێکردن بەرە بەرە ڕیزەکانی ناوخۆشی پاك کردەوە، حردان عبدالغفاریان لە کوێت کوشت، صالح مەهدی عماشیان کردە سەفیر، عبداللە سلوم السامرائیو صلاح عومەر عەلیو زۆری تریان دەرپەڕاند، چەكو تەقەمەنیەکی باشی لە یەکێتی سۆڤیەت وەرگرت ، بە کورتی بڕوای وابوو شۆڕشی کورد بە هێرشێکی گەورە دەشکێ .

پارتی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئێران بەهێزتر کرد، چەكو تەقەمەنی پەیدا کرد، خەڵکی عەسکەری زۆر ڕوویان لە شۆڕش کرد، بەڵێنیان وەرگرت هەموو پشتگیریەك بکرێن، چەکی دژی ئاسمانیان بەهێز کرد بڕوایان وابوو بە هیچ شێوەیەك هێزی ئاسمانی عێراقی ناتوانی هێرش یا پەلاماری بنکەکانی سەرکردایەتی بدات . وایان دانا کە چەند مانگێك شەڕ دەبێتو مفاوەزات وەکو جاران دەست پێدەکاتەوە . بەرە بەرە دەزگاکانی شۆڕش بەهێز کران، بە ئاشکرا شەڕ کردنەوە هەستی پێدەکرا تا ئارامی لە ناوچەکانی کەرکوك ـ خانەقین ـ سنجار ـ مەندەلی ـ باڵی کێشا خەڵك تەواو نائومێد بوو، کە بەیانی ١١ی ئازار لە کاتی خۆی جێبەجێ دەکرێ ، کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزی بەردەوام دەبەسترا، دیارە زۆربەیان لایەنگیری شەڕ کردنەوە بوون، وەکو بڵاوکرایەوە وەفدێکی پارتی بە سەرۆکایەتی کاك حەبیب محمەد کەریم سکرتێری پارتیو دارا توفیق لە بەغدا وتووێژیان لەگەڵ نوێنەرانی حوکومەت کرد، دیاربوو هیچ ئەنجامێکی وای نەدا بەدەستەوە . کاك حەبیب لە بەغدا چاوی بە نیکولای شاوسیسکۆ سەرۆك کۆماری ڕۆمانیا کەوت .

دیارە سەدام حوسێنو حکومەتی عێراق داوایان لە وەفدەکەی پارتی کردبوو ئەگەر بارزانی بڕوای بە ڕێکەوتن هەیە باکوڕێکی خۆی بنێری، دیارە ئەوان دەیانویست ڕێك نەکەوتن بخەنە ئەستۆی پارتی .

چەند ڕۆژێك پێش ١١ی ئازار خوالێخۆشبوو ئدریس بارزانی گەیشتە بەغدا وا دەرکەوت حکومەتی عێراق پێی داگرتووە، کە دەبێ لە ١١/ ٣/ ١٩٧٤دا یاسای حوکمی زاتی بڵاو

بکرێتەوە . لەبیرمە کاک ئدریس گەڕایەوە، چەند کۆبونەوەیەک کرا داوایان لە حکومەتی عێراق کرد مانگێك بڵاوکردنەوەی مەشروعی حوکمی زاتی دوابخات تا بیرێکی باشتری لێدەکەنەوەو نەبێتە هۆی شەڕو شۆڕ لە کوردستان . کاک ئدریس بارزانی لەو بڕیارەی شۆڕش سەدامی ئاگادار کردەوە . بە داخەوە سەدامو ڕژێمی عێراق داواکەیان خستە پشت گوێ هەر لەبەر ئەو هۆیانە بوو، کە لە سەرەوە باسمان کرد ..!

لە ١١/ ٣/ ١٩٧٤ یەك لایەنە حکومەتی عێراق لە ئێسگەو ڕۆژنامەکاندا پرۆژەی حوکمی زاتی بۆ کوردستان بڵاوکردەوە، ماوەی مانگێك مۆڵەت درا هەر کەسێك پێی ڕازی بێتەو پەسەندی بکات دەتوانێ بگەرێتەوە بە کورتی (عفو عام)ی دەرکرد. بەم جۆرە هەموو دەست پێشخەریەك لە دەست پارتی دەرهاتو تەنیا ڕێگای شەر کردنەوەی کەوتە پێش . گەلی کورد هەموو بەگشتی بە دەوڵەمەندو هەژارەوە بە ئەندازیارو پزیشكو خوێندکارو فەرمانبەرو کرێکارو جوتیارو شوانو سەربازو پۆلیسەوە پشتگیری لە شۆڕشەکەی کردو لە حکومەت ناڕازی بوون پاڵیان دایەوە بەشاخ ، تەنیا ئەوکۆنە خۆفرۆشانە نەبێت کە فرچکیان بە خیانەت کردن گرتوەو بوونەوە دار دەستی ڕژێم .

بەم جۆرە شەڕ لە کوردستان دەستی پێکردەوەو بە فەرمانی بارزانی نەمر هەموو ئۆتۆمبیلی وەزیرەکانو پارێزگارەکانو دەزگاکانی حکومەت درایەوە بە حکومەت .

## دەست کەوتەکانی بەیانی ١١ ی ئازار

بەیانی ١١ ی ئازار یەکێکە لە دەستکەوتەکانی شۆڕشی ئەیلول، بە خوێنی چەندین پێشمەرگەی قارەمان، خوێنی هەزاران کوردی دانیشتوی هەژار بەدەست هاتووە، حکومەتی عێراق خێرو سەدەقەی بە کورد نەداوە، لە پیاوەتیو مرۆڤایەتیدا مافی کوردی نەسەلماندووە .! تا لەو بارو دۆخو کاتەدا توانای تری نەمابوو غەیری داننان بەو مافە نەبێ، گەورەترین دەست کەوتەکانی بەیانی ١١ ی ئازار بەبۆچونی خۆم ئەمانە بوون :

١. عێراق بەفەرمی دانی بە کێشەی کوردا تا کە لەمێژە لەژێر پەردەی ڕەشدا مابوو .

٢. هەر چەند زمانی کوردی پێشتر ئازاد بوو، بەلاَم لە بەیانی ١١ ی ئازاردا بە فراوانی گەشەی کرد، چەندین دەزگای تایبەتی دامەزرابوو لێکۆڵینەوە لە ئەدەب، چیرۆك، مێژوو، زمانی کوردی .

٣. یەکگرتنەوەی گەلی کورد لە عێراق، ئاشتبوونەوەی هەردوو باڵەکەی پارتی لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیە سەدان پێشمەرگەو کادیری دڵسۆزی گەلەکەمان شەهید کران، هەروەها سەرکردایەتی شۆڕش لێبوردنی گشتی دەرکرد بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەپاڵ دوژمن شەڕیان لەگەڵ پێشمەرگە دەکرد زۆربەی سەرۆك جاشەکان گەڕانەوە .

٤. وەرگرتنی قوتابی کورد لە کۆلێژی پۆلیس، سەربازیو هەندێ کۆلێژی .

٥. ئاسایی بونەوەی دۆخی کوردستان پاش چەندین ساڵ شەڕو شۆڕو ئاوەدان کردنەوەی کوردستان .

٦. وریابونەوەی خەڵكو زیندوکردنەوەی کوردایەتی لە دڵو دەروونی زۆر کەس بە تایبەتی کوردە پەڕاگەندەکانو ئەوانەی لە هەندەرانن .

جگە لەو ڕاستیانەی سەرەوە بەیانی ١١ ی ئازار شتێکی گرنگی ئاشکرا کردبوو ئەویش ناسینی لێپرسراوانی شۆڕشو گێڕانەوەیان بۆ سەر ڕاستی خۆیان هەندێ لە لێپرسراوان بە گەورەترین شۆڕشگێڕو دڵسۆز ناسرابوون .. کەچی لە کاتی ئاشتیدا هەڵسوکەوتو کردەوەکانیان تەنیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان بوو .

بەیانی ١١ ی ئازار زیاتر کوردی بە دنیا ناساند زۆر دەوڵەتو ڕێکخراوی مرۆڤ پەروەر، خۆشحاڵیان بەو ڕێکەوتنە دەربڕی ، گەلێ کورد لە زۆر کۆڕو کۆبونەوەی دنیا هەلی بۆ ڕەخسا، کە بیروڕاکانی خۆی دەربڕێ .

## دەست پێکردنەوەی شەڕ

لە ١١ ی ئازاری ١٩٧٤ یاسای ئۆتۆنۆمی بلاوکرایەوە لە بەغدا زۆربەی دەستکەوتەکانی ١١/ ٣/ ١٩٧٠ دزی بوو، لەو یاسایەدا سنووری کوردستان دیاری نەکرابوو ئەنجومەنی تەشریعیو تەنفیزی هیچ دەسەلاتێکی کە لە پێشانیش هەمووتان دەزانن بە هەر دوو مەجلسەکە هێندەی ئەفسەرێکی ئەمن دەسەلاتی نەبوو ..! نیوەی گەنجو ئەوانەی توانای شەڕکردنیان هەبوو هاتنە پاڵ شۆڕش بە سەدان پزیشکو ئەندازیارو سەرباز بە هەزاران خوێندکاری خوێن گەرم بە هەزاران کرێکارو جوتیار داخەکەم شۆڕش نەیتوانی سود لە بەهرەی ئەو هەموو خەڵکە وەربگرێو بەجوانی (ئیستیعابیان) بکات. سەرلەنوێ دەزگاکانی شۆڕش دامەزرایەوە هەروەها ئەمانەتەکانیش دامەزران هەقە ئەوە بنووسین، کە دەزگاکانی شۆڕشی ئەیلول چۆن پێک هاتبوون:

١. **مەکتەبی سیاسی .**

٢. **دەزگاکان :**

أ۔ مەکتەبی عسکەری ، عەبدولوەهاب ئەتروشی لێپرسراو بوو کاک حەمید بەرواریو کاک رەئیس یوسف ئەندامی مەکتەبی عسکەری .

ب ۔ دەزگای دارایی، کاک عەلی عەبدوڵلا لێپرسراوی بوو، پاشان کرا بە ئەمانەتی داراییو ئابووری .

ج ۔ ئەمانەتی زراعە ۔ کاک شەمسەددین موفتی .

د۔ ئەمانەتی پەروەردە ۔ کاک محەمەد ئسماعیل .

هـ ۔ ئەمانەتی ناوخۆ ۔ کاک موحسین دزەیی .

و ۔ ئەمانەتی ئیشغالو ئیسکان ۔ کاک نوری شاوەیس .

ز ۔ ئەمانەتی ڕاگەیاندن یا بەشی ڕاگەیاندن ۔ خوالێخۆشبوو دارا تۆفیق .

ح ۔ تەندروستی ۔ یەکێك لە دکتۆرەکان وە کاک د. مەحمود سەرپەرشتی دەکرد.

گ ۔ بەشی کۆمەلایەتی ۔ کاک شاخەوان .

ی ۔ بەشی پاراستن ۔ کاک شەکیب عەقراوی .

هەڤاڵن حەبیب کەریم‌و کاك دکتۆر مەحموود کاروباری مەکتەبی سیاسیان بەڕێوە دەبرد، سەر لەنوێ هێزەکانی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان ڕێك خرانەوە، کە لەگەڵ هەل‌و مەرجی شەڕ بگونجێ‌و بەم شێوەیە بوو: ـ

١. هێزی دەشتی هەولێر ـ کاك فارس حەمەد باوە .

٢. هێزی سەفین ـ کاك رەسولّ فەقێ .

٣. هێزی بێتواتە ـ کاك عەلی شەعبان .

٤. هێزی کاوە ـ کاك حەسۆ میرخان ژاژۆکی .

٥. هێزی باڵەك ـ کاك عەولاّ ئاغا پشدەری .

٦. هێزی هەندرێن ـ کاك سلێمان سندی .

٧. هێزی خەبات ـ کاك فەتاح ئاغا .

٨. هێزی رزگاری ـ کاك رەئیس عەبدوڵلا .

٩. هێزی کەرکووك ـ کاك فازڵ سۆرانی .

١٠. هێزی قەرەداغ ـ کاك فازڵ تاڵەبانی .

١١. هێزی حەمرین ـ کاك عەبدولڕەحیم جەسیم .

١٢. هێزی شێخان ـ کاك عیسا سوارە .

١٣. هێزی عەقرە ـ کاك زوبێر زێباری .

١٤. هێزی هەڵگورد .

١٥. هێزی ئەزمەڕ .

١٦. هێزی زەمناکۆ .

١٧. هێزی ئامێدی .

١٨. هێزی شینی زاخۆ .

١٩. هێزی دهۆك .

٢٠. هێزی ئازادی ـ خورشید شێرە .

لەشکری یەك لەلایەن کاك ئەسعەد خۆشەوی سەرپەشتی دەکرا. جگە لەو هێزانە چەند بەتالیۆنێکی سەربەخۆ، کە پەیوەندیان لەگەڵ بارەگای بارزانی‌و مەکتەبی عەسکەری هەبوو .

١. هێزی کۆسرەت ـ شەهید دکتۆر خالید سەعید .

٢. هێزی ئاسۆس ـ کاك عەزیز ئاغا .

٣. هێزی خانەقین .

٤. بەتالیۆنی (١) زۆزك ـ نەقیب حەسەن بارزانی .

٥. بەتالیۆنی (٢) زۆزك .

٦. بەتالیۆنی (٣) زۆزك .

٧. بەتالیۆنی (٤) زۆزك .

ئەو چوار بەتالیۆنە هەموویان لەو عەسكەریانە پێك هاتبوو، كە پەیوەندیان بە شۆڕش كردبوو نیمچە هێزێكی نیزامی دوارۆژی لێرەچاو دەكرا هەر بەتالیۆنێك (٤٠٠) پ ـ م بوو.

لە بارەگای مەكتەبی سیاسیو عەسكەری چوار لقی پێشمەرگە هەبوو :

١- نەجمەدین گورونی .

٢- حەمەد ئەمین ڕەشكە .

٣- ملازم عەلی كە لێپرسراوی لقێكی دژی ئاسمانی بوو .

٤- ملازم وەلید نەقشبەندی ئەویش لقێكی دژی ئاسمانی لەبەر دەستابوو .

لەناو پردانو چۆمانو مەمی خالآن كە بارەگاكانی مەكتەبی سیاسیو عەسكەریو ئێسگەی لێبوو نزیكەی (٢٠ ـ ٣٠) بنكەی دژە ئاسمانی لێبوو، كە بریتی بوو لە : دۆشكەی ٢٠ ملمو ٣٠ ملمو ٦٠ملم، كاك یوسف سەرپەرشتی بەشی هەندەسەو تەخریبی دەكرد. كاك موقەدەم عەلی لێپرسراوی بەشی مەدفەعیو فەرماندەی گشتی بەرگری میللی بوو . ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە ئەو خوێنكارانە بوون، كە كاریان بە مەدفەعی ١٠٦ ملم دەكرد زۆر بەجوانی لەسەر جێبەكان دادەنیشتنو بەرەورووی شەڕ دەڕۆیشتن داخی گرانم بەدەیان خوێندكار لە كاتی شەڕی بەرامبەر دەبابەكانی دوژمن شەهید كران .

لە ڕۆژەكانی دوای شۆڕش، شەهید عەلی عەسكەری كرا بە فەرماندەی هێزی قەندیل ، چەكەكانی شۆڕش بریتی بوون :

لە تۆپی ١٢٢ ملم، هاوەن، كلاشینكۆف، برنۆ، ئەلغام بە هەموو جۆرەكانی . چەكە دژە ئاسمانیەكان ٢٠ ملمو ٣٠ ملمو ٦٠ ملم دۆشكە لە كۆتایی شۆڕش مەلوتكەش گەیشتە دەست پێشمەرگە .

پاش تەواوبوونی عەفوی عامەكە دوژمن لەهەموو لایەك هێرشی بۆ سەر كوردستان دەست پێكرد ، هەموو هێزو توانای خۆی بەكار هێنا ، بۆ بەهێزكردنی خۆیی‌و دوبارە خۆرێكخستنەوە، پێشتر لە ناوچەی ڕانیە پاشەكشەی كردبوو بۆ كۆیەو هەیبەت سوڵتان، لە ڕەواندزو دیانە بەرەو

کورەك‌و گوزەر کشایەوە . فڕۆکەکانیان بە چڕی بارەگاکانی سەرکردایەتیان بۆردومان دەکرد، شەوانەش بە فڕۆکە پەلاماری دەدا، کە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، بەلاّم نەیدەوێرا بچێتە لای حاجی ئۆمەران . لە ٢٤/ ٤/ ١٩٧٤ زۆر بە نامەردانە لە قەلاّدزێ بە سەدان کەسی شەهید کردو سەدانیشی بریندار کرد، پاش سێ ڕۆژ لە شاری هەلّەبجەشی داو بەو جۆرە ترس‌و سامێکی زۆری خستە دلّی خەلّکەوە . لەبەرەکانیش شەڕ بە گەرمی دەستی پێکرد، پێشمەرگە زۆر مەردانە بەرەنگاری هێزەکانی دوژمن بوەوە، ئازایانە بەرگریان دەکرد بەتایبەتی لە جەبهەی ڕەواندز دوژمن زەرەرو زیانی زۆری لێکەوت . چەندین هێرشی دلێرانە کرایە سەر مۆلّگاکانی دوژمن لە شاخی کۆرەك‌و گۆرەز، بەهۆی قایمی شوێنەکان نەتوانرا پاشەکشە بەهێزەکانی دوژمن بکرێ، هەرچەندە ئێران چەك‌و تەقەمەنی دەدا بە پێشمەرگەکان بەلاّم پێشمەرگەش گیانی خۆڕاگری زۆر بەهێز بوو . لە هاوینی ١٩٧٤ لە زۆر شوێن دوژمن پێشڕەوی کرد بە تایبەتی لە ناوچەی دەشتی هەولێرو گەرمیانەکان، پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر زۆر بە ئازایی‌و چاونەترس ناویانگیان دەرکردبوو، لەو شەڕە دوژمن توانی ورەو زاتی ئەو هێزە بشکێنێ هەموو سنووری چالاکی ئەو هێزە داگیر بکاتەوە لە جەبهەی ڕانیە دوژمن پاش ئەوەی زەرەروزیانی لێکەوت توانی ڕانیە داگیر بکاتەوە . لە هێرشەکانی بۆ ناوچەی دۆلّەڕەقەو ماکۆك تا کۆتایی شۆڕش نەیتوانی شوێنە گرنگەکان بگرێت . پاش چەندین مانگ شەڕ، پاش ئەوەی بە هەزاران جاش‌و سەربازی لێ کوژرا ئەوجا هاتەوە ڕەواندزو دیانەو چیای زۆزك‌و سەرتیزی گرت . لە ناوچەکانی سلێمانی‌و دهۆك شەڕ بەم دەستوورە بەردەوام بوو . بە قسەی سەدام حوسێن هێزەکانی ڕژێم زیاتر لە (٦٠,٠٠٠) شەست هەزار کوشتارو برینداری لە ماوەی ئەو سالّە زیانی گیانی بووە . لە هاوینی ١٩٧٤بەرەبەرە هێزەکانی ئێرانی بە تۆپ‌و جبەخانەوە هاتنە کوردستان، دیارە خەلّك زۆر پێیان خۆش بوو منیش ئەو کات هەر هەمان بڕوام هەبووە . لە چۆمان بووم، ئێوارەیەك تاریك داهاتبوو نزیکەی (٢٠) ئوتومبیل سەربازی ئێرانی بەرەو گەلاّلە دەڕۆیشتن هەموومان شادمان بووین، کەچی کاك بەهرام خدر ئەحمەد خەلّکی دەربەندی گۆمی کەندیناوە کە خزمێکی منە نەخوێندەوارو بێ تەجروبە سیاسەتی نەدەزانی لێمان ڕاست بوەوەو وتی: ئینجا شۆڕش فەوتا ئەو کات زۆرمان گالّتە پێکرد بەلاّم ڕاست قسەکەی جێی خۆی گرت ئەوەی وتی پاش چەند مانگێك هاتەدی . ئێرانیەکان بنکەیەکی صاروخی هۆکیان لە مەمی خەلان دامەزراندبوو فڕۆکەیەکی تۆپۆلیف هاتە سەر چۆمان‌و پێکایان، چی تر فڕۆکەمان لە ئاسمانی ناوچەکە بەدی نەکرد، لە ماوەی یەك سالّ شەڕ زیاتر لە پێنج فڕۆکەی دوژمن کەوتە خوارەوە، فڕۆکەوانەکانیان بەدیل

گیران یان کوژران . ڕاسته شەڕێکی زۆر قارەمانانه کرا پێشمەرگه ئامادە بوو بەڵام هێنانی هێزی ئێران ڕۆڵێکی خراپی گێڕا بۆ ساردکردنەوەی خەڵك‌و پێشمەرگە ، بە پشتی ئێرانیەکان وازمان لە زۆر سەرەتای پێشمەرگایەتی هێنا، دەیان گوت شاهەنشاه بەرگری لە هەموو ئاری نەسەبێك دەکات ئەو شاهەن شاهەی، کە بە هەزاران ڕۆڵەی میللەتی قات‌و قڕ کرد. بەڵێ سوپای کوردستان توانی بۆ ماوەی یەك ساڵ بەرگری لە زۆربەی ناوچە ڕزگار کراوەکان بکات، توانی زەبری جەرگ بڕ لە دوژمن بدات هەر ئەو شەڕکردنەش بوو وای لە ڕژێمی عێراق و سەدام حوسێن کرد، کە بچێتە جەزائیر لەوێ مساوەمە لەسەر خاکی عەرەب بکات‌و نیوەی شط العرب بداتە ئێران بەرامبەر بەوەی کە شاه هاوکاری بکات بۆ لەباربردنی شۆڕشی هەق خوازی گەلی قارەمانی کوردستان .



**شەهید ڕێبازو شەهید حەسەن کوێستانی**

## کردنەوەی ئۆردوگا لەئیران

سەرکردایەتی شۆڕش نەخشەو پلانی ڕێكو پێکی دا نەنابوو تاکو بزانێ چۆن شەڕ لەگەڵ دوژمن دەکا، چەند پێشمەرگەی پێویستە، شێوەی شەڕەکان چۆن بێت بە سەدان هەزار کەس ڕووی لە شاخو چیاکانی کوردستان کردبوو . زۆر کەس هیچ سوودی لێوەرنەدەگیرا تەنانەت هەندێکی کوێرو شەلیش لەگەڵ (یاأللة) کەوتبوون . ئەو هەموو خەڵکە دەبی جێگای پشودانی هەبێت، نانو ئازوقەو شتومەکی پێویستە، یارمەتی مانگانەی دەوێ، بێ گوێ دانە ئەمانە هەرچی هات بێ بەرنامەو پلان لە مەکتەبی عسکەری یان لە ئەمانەتەکان ناونوس کران، نیوەی موچەی خۆی وەردەگرت، دیارە ئەوە یارمەتیو خەرجی زۆری گەرەکە، حکومەتیش هەندێك شوێنی داگیر کردەوە، هەندێ شوێنیش شەڕی لێنزیك بوەوە، دیارە منداڵو ژنو بێ چەکەکان نابێ لەو شوێنانە بن ، ناوچە ڕزگار کراوەکانیش هەمیشە پەلاماری فڕۆکەی لەسەر بوو خەڵکەکە سەری لێشێوا ، ترس دایگرت، بەهەر حاڵ ئەو هەموو هۆیە وایکرد ، کە ئۆردوگا لە ئێران بکرێتەوە زیاتر لە (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار منداڵو ژنو پیرو پەك کەوتەو واللە برام هەندێك گەنجی ڕێكو پێکیش چوونە ئێرانو بوونە پەناهەندەو لە ئۆردوگا نیشتەجێ کران بەهەق ئێران میوانداری باشی کرد بەڵام لەبیرت نەچێت بۆ مەرامی سیاسی خۆی، کە کاری تەواو بوو چی خراپ بوو لەگەڵی کردن .

## رێککەوتننامەی جەزائیر

ڕۆژی ٦/ ٣/ ١٩٧٥ لەناو پردان بووم، ئێستگەو ئاژانسەکان دەقی ڕێك کەوتننامەی بڵاوکردەوە . سەدام حوسێن جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەجیاتی عێراق ، محەمەد ڕەزا پەهلەوی شای ئێران لەجیاتی ئێران ئیمزایان کرد. خەڵك لە ڕۆژی یەکەم هیچ ناڕەحەتی پێوە دیار نەبوو، هەندێك هەر لەسەر باوەڕی پێشوو لێکدانەوەیان دەکرد، کە شا هەرگیز خیانەت لە گەلی کورد ناکات . شا پاش گەڕانەوەی لە جەزائیر داوای دیدەنی سەرۆك بارزانی نەمری کرد .

زۆرم پێ ناخۆش بوو، کە بارزانی چووە ئێران چونکە شاو ئێرانیەکان بە گشتی لە هەلێکی وەها دەگەڕان، کە پیاوە ناودارەکانی کورد بکوژن . بارزانی نەمر لەگەڵ د. مەحمودو کاك موحسین دزەیی لە تاران شایان بینی . خەڵك ڕۆژانی ٨، ٩، ١٠ بەتەواوی پەشۆکا بوون، لێپرسراوانی شۆڕش وەڵامی هیچ پرسیارێکیان پێنەبوو، ئەوانیش چاوەڕوانی گەڕانەوەی بارزانیان دەکرد. زۆر کەسم بینی دەگریا، چارەنووس خۆی نەیدەزانی ، هەندێك لە لێپرسراوەکان لە خەڵکی نەزان گەلێك خراپتر بوون ..! حکومەتیش لەو هەراو وریایە چەند هێرشێکی کردە سەر چیای حەسەن بەگ ، لەبەر زیوە بوو (ماولیان) بە راستی پێشمەرگە دەستی باشیان کردەوە، دوژمنیان تێك شکاند، زۆر پێشمەرگەی دڵسۆزم بینی دەیانووت: کاکە ئەمڕۆ ڕۆژی پیاوانە بە پشتیوانی خۆمان شەڕ دەکەین، نازانم چ بنووسمو بڵێم چی .....!؟

بەرە بەرە تۆپو سەربازەکانی ئێران کشانەوە، بە جارێك دنیا شڵەژا، خەڵکە بێنیشو کارەکەش بەرەو ئێران دەڕۆیشتن بە کورتی کەس هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو، بارو دۆخەکەم زۆر بەئاڵۆز دەزانی بەڵام هەرگیز بیرم لە چەك دانان نەدەکردەوە . دەمووت دەکوژرێین، بە هەموو دەوڵەتەکان لێمان دەدەن، ڕەنگە بمرین لە برسان، بەڵام چۆن ئەو شۆڕشەی چواردە ساڵە پەروەردەی دەکەین بهێڵین وا بە ئاسانی لە دەستمان بکەنەوە ..!

لێرەدا چیتر باسی ئەو کارەساتە ناکەم بەجێی دەهێڵم بۆ ئێوەی خۆشەویست بەڵام ..! ئەوەی هەرگیز نەمدەویست گوێم لێبێ منیش چەکەکەم لە چەمی ناوپردان فڕێ بدەم . ناتوانم هەستی خەڵكو پێشمەرگە دەربڕمو بینووسم چونکە بە راستی ڕۆژێکی ڕەش بوو، بەلێشاو پێشمەرگە بەرەو ئێرانی دوژمن بە کورد دەڕۆیشت ، سەدان پێشمەرگەی قارەمانم دی دەگریا، لە داخا تفەنگەکەی لە چەمی ناوپردان فڕێدەدا، وەکو مێگەل کۆدەبونەوەو نەیاندەزانی کام گورگ دەیان

خوا، ئەو هەموو لاوە جوانانە نائومێد بوون، بە ناچاری هەندێك خۆیان تەسلیم بە عێراق کردەوە، هەندێکشیان بەرەو ئێران ڕۆیشتن، بێئەوەی بزانن چیان بەسەر دێ، چەکە جوانەکانی شانی پێشمەرگە، کە هەتا دوێنێ بەعسیە خوێڕیەکان لێی تۆقیبوون ئەمڕۆ بە پاکەتە جگەرەیەك ئالوگۆڕ دەکرا، ئەو ڕووداوە دڵ تەزێنە ئەو کارەساتە جەرگ بڕە منی بە جارێك هەژاند ئێستاش کە بیرم دێتەوە مچوڕکە بەلەشمدا دێت وەکو فیلمی سینەما دێتەوە پێش چاوم، کە چۆن میللەتەکەمان سەرگەردان ببوو دوژمنانیش بە ئارەزووی خۆیان کەوتبوونە ناوی، بە کورتی دەڵێم : دەتوانرا هێزەکانی خۆمان بە شێوەیەکی تازەتر ڕێك بخەینەوە وەیا بەشێوەی پارتیزانی بە ڕەنگاری ئەو ڕژێمە بۆگەنە بینەوە . ڕاستیشە دۆخەکە چەند بڵێی دژ بە بەرژەوەندی گەلی کورد بوو پیلانی دوژمنان زۆر بەهێزبوو . ئەو باسە سەدان لاپەرەی پێویستە لەسەری بنووسرێ کەچی هەندێك بە نامیلکە باسی ئەو کارەساتەیان کردووەو خۆیانیان لێبێبەری کردووە منیش لە وەلامی ئەو نامیلکەیەدا کە هەڤاڵن د. مەحموودو کاك سامی نووسیویانە دەڵێم : بارزانی تەمەر هەموو ژیانی لە پێناوی گەلی کورد تەرخان کرد شەڕکردنی لەگەڵ ئێران‌و عێراق‌و تورکیاو چوونی بۆ یەکێتی سۆڤیەت بەڵگەی قسەکانمە هەر بۆیەش دەڵێم : لە پێشەوە خاوەنی ئەو نامیلکانە ئۆباڵیان لە ئەستۆدایە .

ماوەیەکی کورت لە ئێران مامەوە، کەوتینە بەر دەستی ژەندرمەو ساواك، باوکم هات بەدوامدا گوتی: لێرەش هەر هیچ نیە، دنیا لە کوردستانی عێراق ئارامترە لە مانگی ١٩٧٥/٥ بە دڵێکی پڕ لە پەژارەو خەم لە پشتەوەی سەیارەکی عەسکەریدا گەڕامەوە کوردستانی خۆشەویست . لە حاجی ئۆمەران لەلایەن چەند سەربازێك قسەمان بۆ کرا، هیچ قسەیەکیان نەکرد کە هەست بەوە بکەین، کە شەرمەزارین ..! بەلام چۆن ڕوومان بێت لە هەولێرو شارەکان قسە بکەین هەر ئەو شەوە گەیشتمەوە هەولێر پاش ئەوەی سێ ساڵ هەولێرم نەبینی بوو لەگەڵ واقیعەکە نەدەگونجام . نامۆییم لە شارەکەی خۆشم دەکرد، دەمزانی بەعسیەکان چیان بوێ دەیکەن، بەڵێ گەڕاینەوە خەلکی کوردستان چارەنووسی دیار نەبوو، بۆم ناکرێ وەسفی ناخۆشی ئەو ڕۆژانە بنووسم چونکە ژیان بە دیلی لە هەموو شتێك لە دنیا ناخۆشترە، ئێمە دیل بووین کورد هەمووی دیل بوو، تەنیا یەك پۆلیسی ئەمن حکومەتێك بوو لە کوردستان زولمیان دەکرد، کاری وایان دەکرد ناگێڕدرێتەوە، بە بڕوای خۆم کورد هێشتا دەستی لەسەر کالینی خەنجەر بوو .

حکومەتی عێراق لە مانگی ٥/ ١٩٧٥ دا خۆپیشاندانێکی گەورەی سەربازی کرد لە شاری هەولێر بەبۆنەی لەناوبردنی (الجیب العمیل) دەیان سەگەلو سوارمان بینی پەنجەکانیان بۆلای ئێمە ڕادەکێشا جوێنو پەلاریان دەهاویشت ئێمەش چەند برادەرێك لە سووچێك وەستابووین، هەر دەت وت لە شەڕا بەدیل گیراوین، لێوی خۆمان دەکرۆژت ئەوجا جاشەکانیان سەرۆکە لە کردو فشیان کردن .

ئێسگەکانی بەغداش ڕۆژانە دەیان جار شکانی شۆڕشی کوردیان باس دەکردو کاوێژی دەکردەوە، عێراقو ئێرانیش ڕێککەوتن شط العرب نیوەی درا بە ئێران ، لە وشکایش سیف سەعدو زین القوس سەر لەنوێ ئیمزای لەسەر کرا . بەندەی خۆشتان هەمیشە ئەو قسەیەی شەهید د. فوئاد تێکۆشەری کوردی تورکیام بیردەکەوتەوە، کە لە ژێر پەتی سێدارەدا وتی :

لقد كنت أحلم دائماً بالتضحية بحياتي في سبيل وطني ولايساورني الشك بأن راية الاستقلال سترتفع هنا على هذه البقعة من أرض الوطن حيث شنق .

## ئەوا سەرکەوتنی گەلی خۆمم بینی

## ئایا شەڕ دەکرا؟

ئەو پرسیارە لە مێشکی هەموو کوردێك، هەموو کەسێك دەزرنگایەوە وەڵامەکان جۆراوجۆر بوون . ئەوانەی کاریان بە شۆڕش نەمابوو مەرامەکانیان جێبەجێ بوو دەیانووت شەڕ ناکرێ، بە ئێران‌و عێراق لێمان دەدەن، رەنگە تورکیاو ئەمریکاش گەلەکۆمەکی بکەن . هەندێك بە بیانووی ئەو هەموو خێزان‌و ماڵە لە ئێران کە تەسلیم بە عێراق دەکرێنەوە لەبەر ئەوە شەڕکردنیان بە کارێکی خراپ دەزانی .

هیچ ئارایەکی سووربوون لەسەر شەڕکردنەوە نەبوو تەنیا هەندێك بە قسە پڕوپاگەندەی شەڕکردنیان دەکرد.

بەبۆچوونی من شەڕکردن ئەرکێکی شۆڕش گێرانەبوو، شەڕنەکردن گوناح بوو چونکە ئێمە بۆ ئیمزا دەستمان نەدابووە چەك ، کە ئەمریکاو ئێران‌و تورکیا ... هتد لێمان رازی بن بەڵکو ئێمە شۆڕشمان دژی داگیرکەران‌و هێنانەدی ئامانجەکانی گەلی کورد بەرپاکرد هیچ پەیوەندیمان بە ئارەزووی ئەو دەوڵەتانەوە نیە .

ئەو کاتەی عێراق‌و ئێران رێککەوتن زیاتر لە سەد هەزار کورد چەکی بەدەستەوە بوو ڕاستە هەموویان بەبیروباوەڕ نەبون فێری سەرەتاکانی پێشمەرگایەتی نەکرابوون شۆڕشیان بە سەیران‌و گەشت دەزانی گوناهی ئەوان نەبوو خۆمان فێرمان نەکردبوون . بە هەق دەیان هەزار پێشمەرگەو خەڵك ئامادەیی تەواوی خۆ بە کوشت دانیان هەبوو دەیانویست بەسەربەرزی بمرن نەبنەوە دیلی ژێر دەستی دوژمن . ئەو کاتەی، کە سەدام‌و شا رێککەوتن شوێنی گرنگ‌و قایم، شاخی بەرز و سەخت، هەزاران کم[٢] لە خاکی کوردستان لەژێر کۆنتڕۆڵی پێشمەرگە دابوو، زیاتر لە دە قەزاو ناحیە ئازاد کرابوو، چەك‌و تەقەمەنی‌و ئازوقەی زۆر هەبوو، لەشکری دوژمن توشی زەبر لێدانی گەورە هاتبوو، لەشەڕ کردن ماندووببوو، دەیان هەزار کوشتاریان لێکرابوو لەڕووی مادیەوە دوژمن پەکی کەوتبوو بە کورتی هەراسان کرابوو .

هەر بۆیە دەتوانرا بەرە بەرە شەڕی جەبهەی لەگەڵ بکرێت وە بەرە بەرە لەدوایشدا هێزەکانی شۆڕش رێك بخرایەوە. شۆڕش کردن یاسای تایبەتی خۆی هەیە، هەروا هەرەمەکی نیە دەبێ پێشمەرگەی کوردستان بزانێ بۆچی شەڕ دەکات ؟ چەك بەرامبەر کێ بەکار دەهێنێ ؟ دەبوایە شۆڕش هەر زوو دۆست‌و دوژمن دەستنیشان بکات نەدەبوایە جێگۆڕکێ بەو مەسەلەیە بکات .

دەتوانرا زیاتر لە پێنج هەزار پێشمەرگە بە شێوەی پارتیزانی لە کوردستان بڵاوبکرێتەوەو دەستی کوشندەی لە دوژمن بوەشاندایە ، ڕاستە ئەگەر هەر بەو شێوەیەی، کە هەبوو شەڕ نەدەکرا چونکە پێشمەرگەمان فێرنەکردبوو کە پشت بەهێزو توانای میللەتی خۆی ببەستێ کەواتە شۆڕشی کورد بێ ئاگا بوو لە سەرەتاکانی پێشمەرگایەتی . ئەگەر حکومەتی عێراق هێزو توانای هەبوایە لەگەڵ (شا) ڕێك نەدەکەوت (شط العرب)ی نیوەی نەدەدا بە ئێران، کە لە پاشان بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕێك، کە ئێستاش شوێنەواری ماوە .

ڕاستە دەوڵەتانی عەرەب ئەوکات لەگەڵ ئێمە نەبوون بەڵام گەر خۆمان شەڕمان بکردایە بێ گومان مەسەلەکان دەگۆڕان‌و پێم وایە لەوە خراپترمان بەسەر نەدەهات، کە بەسەرمان هات . دەتوانرا هاوکاری لەگەڵ هێزە کوردستانیەکان بکرایەو سەر ئێشەی زۆرمان بۆ ئێران‌و تورکیا دروست بکردایە .. یەککگرتنی هێزە سیاسیەکانی کوردستان‌و پێشمەرگەکان چاکی دەبێ درکی پێبکەن، چونکە جەماوەری کوردستان یارمەتی دەرو پەنای ئەوانەیەو بەبێ ئەوان سەرکەوتن کارێکی مەحاڵە .

پێم وایە ئەو ڕاستیە بە پێچەوانەوە سەیرکراوە هەمیشە پێشمەرگەکان، کە هی حزبە سیاسیەکان ببونە مێردەزمە لەسەر خەڵك‌و هیچ سەرەتایەکی شۆڕش‌و پێشمەرگایەتیان ڕەچاو نەکردووە ، بە ئارەزووی خۆیان لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکدا جوڵاونەتەوە هەر بۆیەش بە ئاشکرا ئەو ڕاستیە سەری هەڵداوە .

کۆمەڵانی خەڵك لەگەڵ ئەو هێزە سیاسیە دورە پەرێزانەدا یان لەگەڵیدا نابن، کە دەسەڵاتیان هەبووە لە ناوچەیەکدا ئەوە هەموو لایەنێك دەگرێتەوە بێ جیاوازی ڕاستە لە پەیڕەو پرۆگرامی حزب‌و هێزی پێشمەرگە هەر چی باشە نووسراوە بەڵام لە کاروکردەوەی ڕۆژانەدا گەلێك دوورە لە نووسینەکان .

لێدان، پارەوەرگرتن، بەندکردنی خەڵك بەبێ تاوان ئیستفزاز کردنی خەڵك، خەڵك کوشتن، ڕێزنەگرتنی پیاو ماقوڵانی لادێکان هەمیشە شۆڕشیان تووشی تەنگ‌و چەڵەمەی گەورە کردووە.

نابێ پێشمەرگە بەرژەوەندی خۆی ڕەچاو بکات، یا بۆ ئەوەی چەکی هەڵ گرتبێ تا مەرامی تاکە کەسی جێبەجێ بکات، پێشمەرگە دەبی خۆشەویست بێت لەناو خەڵك یەك ئامانجی هەبێ ئەویش هێنانەدی ئامانجەکانی گەلە . منیش دەڵێم شۆڕش بەو چەکدارانە ناکرێت، کە هەمیشە گیرفانیان پڕ دەکەن‌و چاویان لە پلەوپایەو خۆهەڵکێشانن بەسەر خەڵکیدا، ڕاوە ڕووت‌و بێ حورمەتی بەخەڵك، کوشتن‌و بڕین دەبێتە هۆی ئەوەی کەس بڕوای بە شۆڕش نەمێنێ . شەڕ

دەکرایەوە ئەگەر بە شێوەیەکی رێك‌و پێك پێشمەرگە رێك بخرێتەوەو فێری سەرەتای پێشمەرگایەتی بکرێت کورد هەزاران رۆڵەی خوێن گەرم‌و دڵسۆزی هەیە بۆ رۆژی رەش ..!

میللەت بیەوێ سەربەخۆ بژی‌و داگیرکەران لە وڵاتی دەرکات‌و مافەکانی بە دەست بێنێ دەبێت ئامادەیی گیان بەختکردنی زۆر بێت ...

گەلی کورد نابێ چاوەروانی یارمەتی لە دوژمنانی بکات ، دەبێت خۆی رێك بخات‌و یەك بگرێ‌و گیان بەختکەر بێت‌و پشت بە کۆمەلانی خەلك ببەستێ ئەوجا رزگاربوونی مسۆگەرە . دەبێت میللەتی کوردیش فێر بێت .. دنیا هەمووی بەرژەوەندیە سۆڤیەتیەکان دەیان زانی ئێمە غەدرمان لێدەکرێت ! ئێمەش میللەتێکین ، کەچی بەرژەوەندی چاوی تاریك کردبوون نەك هەر یارمەتیان نەداین بەڵکو بە چەك‌و یارمەتی ئەوان کورد سەری پان دەکرایەوە ! هیچ دەوڵەتێك نیە لە دنیا بەرژەوەندی خۆی رەچاو نەکات دەبا ئێمەش بە وردی بەرژەوەندی خۆمان رەچاو بکەین ...

## بارودۆخی کوردستان
## پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول

ڕژێمی درندەی بەعس گەلیّ داخی لە گەلەکەمان هەلگرتبوو. لە هەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی ئەو سیاسەتە چاوچنۆکیەی لە مێشکی دابوو دەرهەق گەلەکەمان جێبەجێی بکات .

شکانی شۆڕشی ئەیلول، بلاّوەلێکردنی لەشکری کوردستان، هەلّەکانی لە بنەڕەتەوەی ڕێکخستنەکانی (پدك) هەلێکی لەبار بوو بۆ ڕژێم .

ڕژێم دەستی کرد بەجێبەجیّ کردنی سیاسەتە شوڤێنیانەکەی خۆی بەرامبەر بە گەلی کورد ... لە هەموو ئەو خالاّنە پەشیمان بووەوە لە سالّی ١٩٧٠ لەگەلّ سەرکردایەتی پارتی لە بەیانەکەدا مۆری کردبوو، هەر چەندە بە قسە بە هۆی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆی ڕۆژانە خالّەکانی بەیانی ئازاری کارێژ دەکردەوە بۆ ئەوەی چاوبەستی لە جەماوەری گەلی کوردستان بکاتو واش لە مێشکی گەلاّنو دەولّەتانی دنیا بگەیەنێت، کە مافی کوردەکانی داوە زۆری پێ نەچوو هەموو ئەو چەکدارانەی کە سالّەها بوو ڕاوی پێشمەرگەیان دەکردو کاسە لێسیان بۆ ڕژێم دەکرد لە تەویلەکانیان لە کاوێژی کردنو چەکی کردن ، کورتانو کاو جۆ و ئالێکی پێنەدان .

پاش کەمێك هاوڕێیانی حزبی شیوعیشی هەلّپێچا ، قەیسەری لێکردنە کونە مشك جارجارە ئەندامێکی کارامەشی بەبیانووی جیاجیا لە زیندان دەکرد بە ناچاری سەرکردەکانی (حشع) (أشهدبالله) یان بۆ ڕژێم دەووت هەقی گرتنی ئەندامەکانی خۆی لەلایەن ڕژێم حەلالّ دەکرد ، لە پاشانیش ئەو دەهۆلّو زۆرنایەی، کە هاوڕێیانی (حشع) بۆ بەعسیەکانیان لێدەدا زەوقی دەولّەتیان تێکدا بە کۆمەلّ ڕاکێشران بۆ لێکۆلّینەوە ، دیسان بایان دایەوە، لەو هەموو بگرەو بەردەیە، کە بەعسیەکان بە شیوعیەکانیان دەکرد زیاتر پەیوەندی نێوان سۆڤیەتو عێراق خۆشتر دەبوو ! دیارە (بەرژەوەندی نەتەوەکانی پرۆلیتاریا) وای دەخواست، کە گەلی کوردو کرێکارانی عێراق بە قوربانی سەرمایەدارانو دکتاتۆرو فاشیەکانی بەغدا ببێت . سەرەڕای ئەو خراپەکاریەی، کە هاوکاریان بەرانبەر بە کێشەی گەلی کورد کردیان لە دنیای سۆسیالیستی جاڕیاندا، کە شۆڕشی کورد (جیب العمیل)ەو نابیّ کورد لەگەلّ حکومەتی (تقدمی واشتراکی) نەتەوەی (عەرەب) شەڕ بکاتو بەلّکو دەبیّ ڕازی بیّ بتوێتەوە چونکە بەرژەوەندی دنیا وا دەخوازیّ .

نامەوێ زیاتر باسی چەکداری (حشع) بکەم چونکە گەلەکەمان لە بارودۆخەکە ئاشنان . (جبهەی قومی تقدمی) ناوی جار جار دەهات ئەگەر پێویست بوایە زیاتر زەبر لە کورد بدرێ یان ئازادی خوازانی عێراقی پێ لەناو ببرێ .

احمد حسن البکر کە کەس نازانێ چۆن ! لە حوکم تێهەڵدرا ، لە وتەیەك بەبۆنەی تێك شکانی شۆڕشی کورد وتی : انتهت التمرد ولن تعود والی الابد ..! ئەو لە خۆبایی بوونە ئەو ڕستەیە خۆی لەخۆیدا تانەیەکی گەورەیە کە لە گەلی کوردیدا .

لە کوردستان بە فراوانی دەستی کرد بە گواستنەوەی کورد لە شوێنی باوك‌و باپیرانی ! عەرەبیان نیشتەجێ کرد بە تایبەتی لە ناوچەی (کەندیناوە) لە سەرەتای تەموز واتە چوار مانگ پاش (نسکۆ) بڕیاردرا کە کەندیناوە لە کورد چۆڵ بکرێ بە تایبەتی گوندەکانی (پەلکانە ـ سەرگیسمە ـ تەل هەلاڵە ـ شەناغە ـ قەبری عەلی ... هتد). لەلایەکی تریش بەڵێشاو بەناوی کرێکارو فەرمانبەر عەرەبیان لە کەرکوکدا نیشتەجێ کرد گەلێك فەرمانبەرو پۆلیس‌و کرێکاری کوردیان لە کەرکوك‌و دبس دەرکرد، ڕژێم هەرچەندە مانگێك پاش هەرەس هێنانی شۆڕش بە زۆری زۆرداری دەستی کرد بە بەعسی کردنی خەڵك ، لە هەمان ساڵ دەستی کرد بە هێنانی فەرمانبەرانی گەورە بۆ ئەو ناوچانەی خۆی ناوی نابوو ئۆتۆنۆمی ، فەرمانبەرە کوردەکانی لابرد ئەگەر پیاوی ڕژێمیش بوایە بۆ ئەوەی کوردەکان لە شیوعیەکان هان بدەن هەموو ئەو پێشمەرگانەیان لە سێدارە دا، کە شیوعیەکان لەکاتی شەڕ بەدیلیان گرتبوون‌و تەسلیم بەبەعسیان کردبوون ..! لێبووردنی گشتیش دەرچوو بۆ ئەوانی تر، وشەکانی (وحدە ـ حریە ـ اشتراکیە)ی لە هەموو شوێنە گرنگەکانی کوردستان بەجوانی دەنووسرا لە کاتێکدا داهێنەرانی ئەو وشانە کوردیان قات‌و قڕکرد.

پیاوەکانی (امن ـ استخبارات ـ منظومة ـ ریفیق حزبی) لە هەموو کوچەو کۆڵانێك بڵاوببونەوە دەستیان کرد بەپێ شێل کردنی حورمەتی خەڵکی کوردستان ! سیاسەتی بەعسیەکان لەو ساڵەدا گەیشتە ڕادەیەك، کە هەر کوڕێکی عەرەب کچە کوردێکی بخواستایە پارەیان دەدایە .. ئەو سیاسەتە کاری گەورەی کردبووە سەر مێشك‌و هەستی هەموو کوردێکی خاوەن شەرەف .

بۆنانەوەی ئاژاوە لەنێوان جوتیارەکان‌و دەرەبەگەکان لەلایەك، جوتیارو جوتیار لەلایەکی تر یاسایەکی تایبەتی کشتوکاڵ لە کوردستان جێبەجێ کرا بە ناوی یاسای ژمارە (٩٠)، کە جوتیارەکان بە کۆمەڵ زەوی بەکار بهێنن، کە دەیان گیوگرفتیان بۆ جوتیارانی کورد دروست

کرد، کە تا ئێستاش هەر بن برنەکراوە، بەڵکو لە زۆر شوێن بۆتە مایەی کوشتن‌و برین‌و ناخۆشی لە نێوان خەڵك سیاسەتێکی تری بەعسیەکان دوور خستنەوەی کورد بوو لە کوردستان لە مانگی ٩ / ١٩٧٥ سەدان خێزانی کورد لەسەر پەیمانی گەورە پیاوانی بەعسیەکان لە ئێرانەوە هاتنەوە بە نیازی ئەوەی بگەڕێنەوە سەر موڵك‌و ماڵی خۆیان کەچی ئەو دڕندانە ئەو خەڵکە تێکۆشەرەیان ئاوارەی خوارووی عێراق کرد لە شوێنە دوورەکانیان نیشتەجێ کردن، کە هیچ پێداویستی ژیانیان نەبوو، وە نەدەبوایە لە چوار پێنج ماڵ زیاتر لە گوندێك بن .

ئەو پرسیارە بە زەقی دێتە پێشەوە دەبێ چۆن ئەو خێزانانە کەرامەت‌و شەرەفی کوردایەتیان پاراستبێ لە دەست بەعسیەکان ..؟!

هەر چەندە خۆم نەمبیستووە، کە عەرەبەکان زوڵمی ناموس لە کوردەکان بکەن . بەڵام ناکرێ لێرە ئەو خاڵە فەرامۆش بکەین .

لەبارەی سیاسەتی پەروەردەو زانیاری ڕژێم بەرە بەرە دەستی کردەوە بە (تەعریبی تعلیم) گەلێك دەرسی بەعسیانەیان لە مێشکی منالآنی کورد بە زۆر قایم دەکرد، کە بێ سوود بوو.. ئەندامانی حزبی بەعس بە تایبەتی لێپرسراوەکانیان بەناوی بەبەعس کردنی ئافرەتی کورد بێ حورمەتیان بەسەدان ئافرەت کردو گەلێکیان لەسەر باوك‌و براو هاوسەری خۆیان کردە (خەفیە)و جاسوس تا وای لێهاتبوو هەندێ کەس بە گومانەوە سەیری خێزانی خۆی دەکرد ..!

لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان خێزان حورمەتێکی بەرزی هەیەو شورایەکی پۆڵایین دەوری داوە... ئەگەر بەعسیەکان ئەو شورا پۆڵایینەیان بڕی بێ دەبێ چیان نەکردبێ ..!؟

بۆ زیاتر زەلیل کردنی میللەتەکەمان ڕژێم بڕیارێکی تری دەرکرد کەوا سەدان پیاوی ناودارو ماقوڵ‌و خانەدانی کورد لە کوردستاندا ڕاگوێزی خوارویان بکات لە نیسانی (١٩٧٦) دا ئەو سیاسەتەی جێبەجێ کرد، کە سەرەتایەك بوو بۆ لاوازکردنی کوردستان لە گیانی کوردایەتی .. تا کورد وا لێبکات وەکو کەمالیەکان ..! بۆ ئەوەی نەتوانن لە ماوەیەکی نزیکدا بێنەوە سەر پێی خۆیان ئەو حزبە کوردیانەی کە هەریەکە تەویلەکیان بۆ تەرخان کردبوون لە شارەکان بڕیاری قورسیان بۆ دەرچوو پێش ئەوەش کابرا لە حزبەکەی خۆی (حركة التقدميين الاكراد ـ حزب الثوري الكردستاني ـ حزب الديمقراطي الكردستاني) هەموویان نەك هەر کارتۆنی بوون بەڵکو نرخی جووتە پێلاوێکی تاکەو تاکی کۆنیشیان نەبوو ..! دەبوایە لەپێشدا بەعسی بن ئینجا حزبە بێ بایەخەکەی خۆیان .

جگە لەمانەو گەلێ شتی نارەواو ناپاکی تر، کە بەعسیەکان دەرهەق میللەتی بێ پشتیوانی کورد کردیان، هەموو دۆڵو شاخو ڕێگاو شارو شارۆچکەو گوندو لوتکە بە (ڕەبایە)ی سەربازی تەندرابوون .. جولانەوەی جوتیارەکانیش بۆ ناو کێڵگەو ڕەزو باخەکانیان ئاستەنگ بوو، هەموو ئەو تێکۆشەرانە خرابوونە ژێر چاودێری، کە بە ئاستەم بوونی کوردایەتی یا لەدوا ڕۆژ هەستی کوردایەتیان ڕەنگە ببزوایەو بجولایە .

سەرەڕای زەبرو زەنگی دوژمن، وێڕای ئەو چەوسانەوەیەی، کە لەسەر خەڵك ڕۆژانە هەستی پێدەکرا، کەڕولالی دنیاش بەرامبەر کورد داخێکی گەورەبوو نائومێدیەکانی تەواو کپ کردبوو، چونکە ئێستاش هەندێ کەس پێی وایە دەبێ خەڵكو دەوڵەتان ئێمە ڕزگار بکەن، ئەو ڕاستییەیان ـ فەرامۆش کردووە، کە هەموو میللەتێك دەبێ خۆی لە پێشەوە خەمی خۆی بخوات وە بەخوێنی خۆی خاکی خۆی ڕزگار بکات دنیای دەرەوەش (عامل مساعدة) هۆکارێکی یارمەتیدەدەر .

هیچ حزبێکی سیاسی کورد نە بە ئاشکرا نە بە دزی خەباتی نەدەکرد تەنیاو تەنیا لەو هەلو مەرجە ئالۆزە چەند تێکۆشەرێکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، کە ئەو کات بە کۆمەڵەی مارکسیزم-لینیزم ناو دەبرا لە خەباتێکی سەختو مەردانەدا بوون، کە هەرگیز گەلەکەمان نابێت ڕۆڵی کۆمەڵە لە یادی بکات ، چونکە هەر ئەو بە تەنیا لەو بارە ناهەموارەی گەلی کورد بەشداری کاریگەرانەی هەبووەو چەندین ڕۆڵەی تێکۆشەرو بە وەفا، چەندین سەرکردەی نەبەزو لێوەشاوەو کارامەی لە مەیدانی خەبات چوونە ژێر پەتی سێدارەو ئەوانەی لە خەوی قووڵدا بوون بەئاگای هێنانەوە ئەوانەی پێیان وابوو (دەهۆڵ دراو تەقەی برا) پەشیمان بوونەوە، تێکۆشەرانی کۆمەڵە بێ باك لە هەڕەشەو گوڕەشەی دوژمن بێگوێدانە ژیانی پڕ لە مەترسی، بێئەوەی مردن بەهیچ بزانن شەوە زەنگیان شەق کرد تاریك ترین شەوی کوردیان بە خوێنی خۆیان ڕوناك کردەوە هەموویان فەرموویان لەژێر پەتی سێدارە (کورد نامرێ، ئەوانە دەمرن، کە دەیانەوێ کورد قڕان بکەن) شەهیدانی گەل، قارەمانانی ڕۆژانی ڕەش، کەڵە مێردان (شەهابی شێخ نووریو مامۆستا جەعفەر عەبدولواحدو ئەنوەر زۆراب) جارێکی تر دڵی سەدامیان هەژاندو جارێکی تریش کوردیان بە ئاگا هێنایەوەو لە ژێر پەتی سێدارەدا وتیان : ژیان لە پێناوی گەلە.

بەڵێ ئەگەر چی هەندێك وا دەزانن شۆڕش کردن دەستکری چەند کەسو تاقمێکە، ئالەو ڕۆژە ڕەشەدا ساغ بووەوە کە شۆڕش کردن کاری میللەتەو بەس . ڕژێمی بەعس کەوتە ڕاوناو ئازاردانی هەڤاڵنی کۆمەڵە بە پیلانێکی نامەردانەی هەردوو ڕژێمی دوژمن بە کورد عێراقی

بەعس و ئێرانی شا چەندین تێکۆشەریان لە خستە داوەوە لە زیندانەکانی عێراقدا کەوتنە ژێر ئەشکەنجەو ئازار لەوانە : شەهید خاڵە شەهاب ـ شەهیدان مامۆستا جەعفەر عەبدولواحیدو ئەنوەر زۆراب ـ کاک ئەرسەلان بایز ـ کاک فەرەیدون عەبدولقادر ـ کاک عومەری سەید عەلی - کاک عەلی بچکۆل .

سەرەڕای زیندانی کردنی ئەو هەڤاڵانە، هەڤاڵانی تری کۆمەڵە ڕێگاکەیان بەرنداو کاروانەکەیان بەرەو پێشتر برد شەهید ئارام و کاک سالارو کاک مەلا بەختیارو شەهیدی نەمر عەبدولرەزاق و دەیان تێکۆشەری تر ڕێکخستنەکانیان نوێ کردەوە پلانی تازەیان دانایەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر ڕەوتی خەبات بەرەو پێش بڕوات . نابێ ئەوەش لەبیر بکەین دەستەیەك لە تێکۆشەرانی تر لە دەرەوەی وڵات بە هاوکاری بەڕێز مام جەلال و کاک نەوشیروان لە ١/ ٦/ ١٩٧٥ دا ی.ن.ك) یان دامەزراند کە بریتی بوون لەم هەڤاڵانەی خوارەوە:

١. بەڕێز مام جەلال .
٢. کاک نەوشیروان مستەفا .
٣. د. فوئاد مەعصووم .
٤. د. کەمال فوئاد .
٥. کاک عادل مراد .
٦. کاک عەبدولرەزاق فەیلی .
٧. کاک هومەر شێخ موسا .

سەرکردایەتی (ی. ن. ك) ش لە ناوەوەی وڵات دەمەزرا، کە هاوڕێ ئارام دەورێکی کاریگەری تیا هەبوو پاش شەهید خاڵە شەهاب.

بەڵێ خەڵکینە :

ئەو هەموو کارەساتە دڵ تەزێنە، ئەو هەموو ڕووداوە جەرگ بڕە لە ئەنجامی خۆ بە دەستەوەدانمان بوو پاش ڕێککەوتن نامەی (جەزائیر)، کە لە نێوان سەدامی فاشی و شای گۆڕ بەگۆڕ مۆرکرا.

خۆ ئەگەر شەڕمان بکردایە لەوەی ، کە لە پێشەوە باسمان کرد خراپترمان بەسەر نەدەهات هێزی ئەو کاتەی کورد ئەگەر بە تەنیا بەبێ حکومەتی ئێران شەڕی لەگەڵ ڕژێمی عێراق بکردایە بێ گومان ویژدانی هەموو دنیای دەهەژاند هەڵو مەرجی ئەو کات زۆر لەبارتر بوو لەوەی، کە جارێکی تر شۆڕش دەست پێبکاتەوە ..!

دیسان ئەو هاوارو گریانەم پەسەنداً بکەن دەبێ خۆمان شەڕ بکەین، دەبێ خۆمان بۆخۆمان بسەلێنین، دەبێ خۆمان خاکی خۆمان خۆشتر بوێ، چاوەڕێ مەبن کەس لە کورد کوردی زیاتر خۆشتر بوێ، منیش دەڵێم یارمەتی و پشتیوانی دنیا پێویستە بەڵام، کە خۆمان شت بین کێ حەدی هەیە یارمەتیمان نەدا ..؟

(٣) ملیۆن کەس گەمەی پێناکرێ هێزی مرۆیی کورد زۆرە، خاکمان بە پیتو بەرەکەتە ئەگەر گیاو گوڵی کوردستان بمێنێ ئێمە شۆڕشمان پێدەکرێ ، سەیری کتێبی(هنری کسینجەر) بکەن بزانن دەربارەی شۆڕشی کورد چی نووسیوە !؟ دەڵێت : ئێمە زوڵممان لە کورد کرد کاتێك پێویستمان بە عێراق هەبوو دژی سوریا بوەستێ شەڕمان بە کوردەکان ڕاگرتو پشتمان تێکردن .. بۆچی ؟ بە پێچەوانەی ئەم قسانە نەجوڵاینەوە ! وەڵامەکەم لایە بەڵام جارێ لە دڵی خۆمیدا دەهێڵمەوە بۆ هەلێکی لەبارتر .

من پێم وایە کورد ئەوەندە بێ تاقی کردنەوە نیە بەڵام نازانم چۆن شاه ئەو فێڵەی لێکردین !؟ چونکە خۆی لە چارپێکەوتنێك لەگەڵ محمد حسەنێن هەیکەل دا دەڵێت : تا ئەو کاتەی کارم بە کورد هەبوو یارمەتیم دان بەڵام ئێمە کاری خۆمان تەواو، وازم لێهێنان . بەو واتایە : ئەگەر بێتو باسی شکستی شۆڕشی ئەیلولو هۆیەکانی بکەین مەسەلەیەکی وا ئاسان نیە، بە کورتیو بە کوردی ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێت ، خولە قەرەدانی بە ئاستەنگ دەزانم، باشتر بڵێم ناوەختە.

## ئاسۆی سەرکەوتن

بە پێچەوانەی زۆر کەس من دەڵێم شۆڕشی نوێی کوردستان یەکسەر پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول دەستی پێکردەوە هەندێك ۲٥/ گوڵانی ۱۹۷٦ وە هەندێك ۱/٦/۱۹۷٦ بە ڕۆژی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە قەڵەم دەدەن من لاریم لەو دوو مێژووە نییە وەکو ڕۆژی بانگەواز بەڵام خەباتی سیاسی کۆمەڵەو (ی. ن. ك) گەلێك پێشتر دەستی پێکردووە خەباتی چەکداری ئەو ڕووژانەی بۆ دەژمێردرێ .. ڕاستە شۆڕش کردن هەموو شێوەکانی خەبات دەگرێتەوە سیاسی، ڕێکخستن، چەکداری، دیبلۆماسی، ڕاگەیاندن، خۆپیشاندان، مان گرتن .. هتد.

دیارە هەموویان خەباتی شاخ بە خەباتێکی ڕەسەن و لە پێشەوە لە قەڵەم دەدەین هەر بۆیە لە باس و خواسی شۆڕشەکان هەر ئەو ڕۆژانە لە مێژووی کورد دەنووسرێتەوە، کە خەباتی چەکداری دەست پێکردووە .

ئایا پارتی دیموکراتی کوردستان داوای مافەکانی گەلی نەکردووە ..؟ تا ڕۆژی ۱۱/۹/۱۹٦۱ پارتی دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە تاکو ڕۆژی ۱۱/۹/۱۹٧٦ نزیکەی ۱٥ ساڵ زیاتر لە خەباتی توندو تیژدا بووە لەگەڵ ڕژێمی کۆنەپەرستی و لەگەڵ جەنەڕاڵ (عەبدولکەریم قاسم) دیارە بەو شێوە خەباتانەی توانیویەتی مافەکانی گەلی کورد مسۆگەر بکات، شێوەی خەباتی لە پاش ۱۱/ ۹/ ۱۹٦۱ چەکداری بووە .

سەدان کادرو دۆست و لایەنگری پارتی لە زیندانەکانی ڕژێم ئەشکەنجەو ئازار دراون خۆی لەخۆیدا شۆڕشێکە، خەڵکی کوردستانی لە سیاسەتی پاشایەتی و سیاسەتی جەنەڕاڵ (عەبدولکەریم قاسم) دەربارەی کورد بەئاگا هێنایەوە ئایا زیرەو هاواری ئەو تێکۆشەرانەی، کە لە زیندانی بەعس لە ساڵی ۱۹٧٥ خۆی لە خۆیدا شۆڕش نیە ..؟ ئایا ئەو هەموو خەڵکە ئاوارەی، کە دوژمن بەزۆری زۆردار لە گوندەکانی عەرەبستانی ئاخنی بوون (دیوانیە ـ ناسریە ـ عەمارە ـ ڕەمادی) خۆی لە خۆیدا شۆڕش نیە؟ .. سازدان و جۆشدانی کۆمەڵانی خەڵك دژی سیاسەتی کورد نەمان لە ساڵی ۱۹٧٥ شۆڕشێکی مەزن نیە ..؟ ئاوارەو دەربەدەربوونی هەزاران هەزار منداڵ و پیاو ژنی کورد لە ئێران و تورکیا سەرانسەری دنیا نارەزایی نیە لە دەوڵەتی زاڵم..؟

پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلولی ۱۹٧٥ پاش شکستی پ ـ م لە ئابی ۱۹۸۸ هەر منداڵ و پیاوێکی کورد هەر کچ و ژنێکی کورد یەك قسەی بەخێری بۆ کورد کردبێ .. بە شۆڕشێکی

بچکۆلانەی قەشەنگ دادەنرێ چونکە ئەوەندە بەهێز و زاڵم بووە هەر قسەیێك بەرامبەری بە شۆڕشێك دەژمێردرێ.

ئەو ئافرەت‌و منداڵانەی، کە لە ڕانیە بە رەنگاری دوو ئەمن بوونەوە لە ئەنجام نەبووە شۆڕشێکی مەزن‌و شکودار ..؟ دەباشە ئەوانە ئەگەر هەمووی دەست پێکردنەوەی شۆڕش نەبێت .. دەبا بزانین چوونەوە شاخی ئەم جارە لە کوێوە دەستی پێدەکرێ‌و ڕووداوەکان چۆن هاتن ..؟

کۆمەڵەی مارکسی لینینی‌و (ی. ن. ك) چالاکانە پاش هەرەس کەوتنە کار بۆ ڕێك خستنەوەی خەڵك‌و زەمینە خۆش کردن بۆ چەك هەڵگرتن‌و شۆڕش دەست پێکردنەوە .

لە شارەکانی کوردستان (ی. ن. ك) لق‌و پۆپی بڵاو بوەوە ڕەگی خۆی بەرە بەرە لەناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە تایبەتی ڕۆشنبیران‌و کرێکاراندا داکوتا .

پاش گەڕانەوەم لە ئێران لەلایەن شەهید عەلی ساڵح ئاگادار کرامەوە، کە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە کار بکەم لە تەموزی ١٩٧٥ لەگەڵ کاك تەڵعەت خدرو محەمەد عوسمان پەیوەندیمان بە کۆمەڵەوە کردو هەولێ زۆرماندا ڕێکخستنەکانی (ی. ن.ك) گەشە پێبدەین لە بیرمە لە هەولێر هەموویان لە ٣٠ تا ٤٠ ئەندام زیاتر نەبووین بۆ مێژوو ناوی هەندێك لەو تێکۆشەرانە دەنووسمەوە :

١. کانەبی عوسمان .
٢. هادی (کرێکار لە کارگەی جگەرە) .
٣. مام بەهرام .
٤. شەهید حەیدەر چوکل .
٥. شەهید عەلی ساڵح .
٦. شەهید مەولود هەمزە .
٧. شەهید محەمەد عەجەم .
٨. شەهید محەمەد زەنگەنە .
٩. شەهید عەبدولرەزاق (لێپرسراوی هەولێر) ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە .
١٠. شەهید محەمەد جەمیل قەشقە .
١١. شەهید سەعدی خەلیل .
١٢. شەهید نادر قەشقە .
١٣. شەهید جەمیل ڕەنجبەر .

١٤. شەهید عوسمان گچکە .

١٥. کاك کۆسرەت .

١٦. کاك شاخەوان .

١٧. کاك تەلعەت خدر .

١٨. کاك ڕێباز .

١٩. کاك فەیزوڵڵا .

٢٠. کاك قاسم عەزیز .

٢١. کاك سەفین .

٢٢. کاك تەحسین کاوانی .

٢٣. مامۆستا بەکر .

٢٤. کاك مەلا غەفور .

٢٥. کاك فاروق عەلی مەولود .

٢٦. کاك یوسف بەحرکە .

٢٧. کاك مەلا سلێمان .

٢٨. کاك مەجیدی عەبدوڵڵا دەروێش .

٢٩. کاك ڕزگار زاهیر .

٣٠. کاك حەمید کەریم .

٣١. وریا حەوێز چوکل .

٣٢. ڕەسوڵ مەحمود (هەوراز) .

٣٣. عەبدوڵڵا تۆفیق .

جگە لەو هەڤاڵنەی کە لە بەندیخانەدا بوون، کە لە پێشەوە باسم کردون‌و خەلکی هەولێر بوون. پێویستە لێرەدا هەندێك باسی ئەو کوڕە تێکۆشەرە ئەو کرێکارە بە جەرگە ئەو پیاوە مەردە بکەین، کە لە ڕۆژی وا تەنگانەدا گەلەکەی‌و خاکەکەی خۆی لەبیر نەکرد، کاك عەلی سالح خەلکی گوندی کانی سلێمانە لە ناحیەی تەق تەق لە کارگەی جگەرەی هەولێر بە کرێکاری بە دەستی خۆی بە عەرەقی نێوچەوانی نانی بۆ ماڵ‌و منداڵ‌و دایکە پیرەکەی پەیدا دەکرد، نەخوێندەوار بوو ناوی خۆشی نەدەزانی بنووسێ ..! بەلاّم هەرچی بۆت بخوێندایەتەوە لەبیری

نەدەکرد بە دەستوخەت هەموو کاغەزێکی ئەگیناسیەوە پەرتوکەکانی مارکس‌و ئەنجلس‌و لینین‌و ستالین‌و ماوسی تونگی باش لێك دەکردەوە .

لە سەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕش لە شاخ‌و دەشتەکانی کوردستان جەولەی دەکرد لە ڕۆژی نەورۆزی ١٩٨٢ لە شەڕێکی قارەمانانەی کەم وێنەدا بە بریندارى خۆی شەهید کرد ..! بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەست دوژمن‌و هاوڕێکانی ڕێکخستن لە سێدارەو گرتن بپارێزێ، زۆربەی تێکۆشەرانی هەولێر هەتا لە ژیاندا ماوین قەرزاری کاك عەلی سالحین چونکە لە ڕیزی پێشەوەی هەموومان خەباتی دەکرد وەگیانیشی کردە قوربانی گەل‌و چینە چەوساوەکەی ..! لە سالەکانی (مفاوەزاتی) پارتی‌و عێراق ئەندامی کۆمەڵە بوو هەر چەند لەسەر ئەم تێکۆشەرە ناودارە بنووسرێت هەر کەمە من ئێستاش خۆم بە قوتابیەکی ئەو شەهیدە نەمرە دەزانم یادی بەخێرو گیانی پیرۆز بێت .

هەر بۆیە بە ووردی بە شوێن هەڵگیرسانەوەی شۆڕشدا دەگەڕام چونکە بە هەڵوێستێکی کوردانەی بەرزم دەزانی.

ڕژێمی عێراق سیاسەتێکی درندانەی دژ بە کورد پەیرەو دەکرد. هەر بۆیە هەندێ یاخی بوون‌و چەك هەڵگرتن پێش نیسانی سالی ١٩٧٦ لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان سەری هەڵدا، لەوانە یاخی بوونی حەمەی مەلا شەریف لە ناوچەی مەنگوڕایەتی‌و سیوەیس لە بناری قەندیل، لەبەر ئەوەی لەگەڵ (ناظر تعاوني) لەسەر دابەشکردنی زەوی ڕێك نەکەوتن .

هەر چەندە ئەو چەك هەڵگرتنەی کاك محەمەدی مەلا شەریف شێوەیەکی شۆڕشگێڕانەی پێوە دیارنەبوو بەڵام خەڵك ئەوەندە بێزار بوو لە دەوڵەت، هەر کەسێك یاخی ببوایە بەچاوی ڕێز سەیری دەکرد ئەگەر دژی بەرژەوەندی هەندێ خەڵکی ستەمدیدەش بوایە لەو ڕوانگەیەوە سەیری دڕندەیی بەعس بکرێ ئەوسا دەردەکەوێ . لە ناوچەی چۆمان تێکۆشەر عەولا بەرزە پێش هەموو کەسێك چووە شاخ‌و دژی حکومەت ڕاوەستا ناوی ئەو کابرایە حکومەتی هەژاندبوو، چونکە حکومەت نەیدەویست هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە بێت، کە ڕێگا بۆ خەڵکی تر خۆش بکرێت، کە دەتوانێ بەرامبەر دوژمن ڕابوەستێت چونکە بەعس وای لە مێشکی خەڵك دەگەیاند هەر کەسێك چەك دژی هەڵبگرێ ، چارەنوسی لەناو چوونە .

ناظر تعاوني حاجی ئۆمەران بووم لە سەرەتای زستانی ١٩٧٦ تا کۆتایی بەهار .

ڕژێمی بەعس هەر وەکو لە پێشەوە باسم کرد لە بەهاری ١٩٧٦ بڕیاری دا:

ئەو کەسانە لە کوردستان دوور بخاتەوە، کە لەناو جەماوەری گەلەکەمان خۆشەویستن یان لە بنەماڵەیەکی بەرێزن، یان لێپرسراوەتیەکی هەبوو لە ئەیلول وەکو (ئامر هێز ـ بەتالیۆن ـ لق ـ پەل ـ کادر .. هتد)یان گومانی لێدەکرێت، کە بیروباوەری کوردانە بڵاو بکاتەوە لە نیسانی ١٩٧٦ دەستی کرد بە گواستنەوەی ئەو جۆرە کەسانە، ئەو کات لە چۆمان بووم لەناو لیستی ناوەکاندا ناوی کاك عەلی کۆ، خوالێخۆشبوو ئەحمەد نەبی، شەهید سەید عەبدوڵڵای تیابوو، ئەوانە لەگەڵ چەند کەسێکی تر بەو داوایەی ڕژێم رازی نەبوون‌و چونە چیای قەندیل ـ کودو ـ کوێستانەکانی سەر سنوور .

داروودەستەی ڕژێم زۆر بەوکارە نیگەران بوون، شەوی دواتر دەستەیەك لەو تێکۆشەرانە هاتنەوە نێو حاجی ئۆمەران بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی خۆیان لە ڕێگا تووشی کەمینی دوژمن بوون کاك سەید عەبدوڵڵا شەهید بوو .

پێویستە ئەو ڕاستیە بڵێم ئەو چەند تێکۆشەرە لە ڕۆژێکی وا سەخت‌و دژوار تەنگ‌و ناخۆشدا بە رەنگاری ڕژێمێکی وا ببونەوە کە جێگای ڕێزێکی زۆرەو دەبێ ئازایەتی‌و چاونەترسی ئەوانە لە مێژوو بنووسرێتەوە بەڵام پێویستە ئەوە ئاشکرا بکەم ، کە هیچ حزب‌و ڕێکخراوێك ئاگاداری ئەوانە نەبوون، هەر ئەو هۆیە بوو، کە لەسەرەوە باسم کرد پاڵی بەو تێکۆشەرانەوە نا کە ئەو ناحەقیە پەسەندأ نەکەن . ئەگەر شەهید بوونی براو دۆستی ئازیزم کاك سەید عەبدوڵڵا بە یەکەمین شەهیدی ناو شاخ دابنرێ کە جێگای خۆیەتی، دەبێت هاوڕێیان خاڵە شەهاب‌و مامۆستا جەعفەرو ئەنوەر زۆراب بە ئەستێرەی شەهیدانی یەکەم بن‌و بە تروسکەی ژیانەوەی کوردایەتی دابنرێن چونکە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان فێرکرد لە مردن نەترسن .

دیارە لەو ڕۆژانە ئەو چەند ڕوودواەی، کە لە پێشەوە باسم کرد بووە هۆی ڕوون بونەوەی بەرچاوی کورد، تا ئەو کاتە من وەکو لێپرسراوێکی کۆمەڵەو یەکێتی بووم لە هەڤاڵنی سەرووی خۆم هیچ مەفرەزەیەکی ڕێکخراومان لە دەرەوە نەبوو .

هەڤاڵ برایم عەزۆ لەگەڵ (٣٦) پ ـ م ی تر لە سوریا بە ڕێگای هات‌و نەهات ..! هاتنەوە کوردستان پاش ماوەیەك بە ناهەق شەهید کران ، ڕۆژی هاتنەوەی ئەو تێکۆشەرانەش بۆ کوردستان ڕێکەوتی ١/ ٦/ ١٩٧٦ بوو هەر بۆیە (ی. ن.ك) ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش دا نا .

شەهید بوونی برایم عەزۆ و هەڤاڵەکانی شۆڕشی کوردی خستە مەترسییەکی گەورە، لەبەر ئەوەی :

١. ناکۆکی نێوان حزبە سیاسیەکان لەو دۆخە ئالۆزەو بەهێزی حکومەتو بڵاوکردنەوەی مەفرەزە سەرەتاییەکان بە ئاستەنگ دەبێتو توشی شەڕی لابەلا دەبنو دوژمنی سەرەکی کە بەعسە قازانجی لێدەکات .
٢. شەهید بوونی (٣٧) تێکۆشەر لەو کاتو ساتەدا ..! پڕکردنەوەی جێگاکەیان زۆر ئاستەنگ دەبێ مەگەر ئەو کارە هەر بە تێکۆشەرانی (ی. ن.ك) بکرێت .
٣. حکومەت وای لە کۆمەڵانی خەڵکی دەگەیاند کە چارەنووسی هەموو کەسێك وادەبێت ئەگەر دژی ڕژێم بوەستێت .
٤. مەترسی خستە ناو دڵی ئەو کەسانەی کە لە ڕێکخستنەکان توندوتۆڵو پۆڵایین نەبوون .
هەر چەندە ئەو زەبرە جەرگ بڕ بوو کە لە گەلی کوردو (ی. ن.ك) کەوت ..! بەڵام تێکۆشەران بڕوایان وایە، کە شۆڕش بە خوێنی لاوەکان گەشە دەکات هەر زوو چەند تێکۆشەرێکی تر لە ناوچەی سلێمانی بە ڕۆشنبیریو کارامەیی شەهید ئارام هاتنە ریزەکانی شۆڕشی کوردستان ، ئەو مەفرەزەیە بەسەر پەرشتی کاك سالار (نەجمەدین عەزیز) لە ٢٣/ ٧/ ١٩٧٦ دا هەنگاوی دلێرانەیان نا بەرەو پێشەوە لەگەڵ چەند تێکۆشەرێکی تر وەکو : کاك شێخ عەلیو کاك حامیدی حاجی غالیو کاك شەوکەتی حاجی مشیرو چەند هەڤاڵێکی تر کۆڕی خەباتیان گەرم کرد .
دەبێ ئەو ڕاستیە بڵێم تا ئەو کاتە هیچ مەفرەزەیەك لە دەوروبەری هەولێر پەیدا نەببو جگە لەوانەی، کە لە پێشتر باسم کردن .
لە ٨/ ٨/ ١٩٧٦ چەند تێکۆشەرێکی تری گەلەکەمان، کە ڕژێم بەزۆر لە خوارووی عێراق نیشتەجێی کردبوون خۆیان گەیاندە چیاکانی کوردستان لەوانە :
هەڤاڵێ کاك عومەر مستەفا دەبابە، شەهید عەلی عەسکەری، شەهید دکتۆر خالید، شەهید سەعدی گچکە، شەهید مەلای حاجی ڕەسوڵ، شەهید تایەر عەلی والی، شەهید قادر مستەفا، کاك سەید کاکە، کاك قادر عەزیز) ئەو هەڤاڵانە هەموویان بە ناوی بزووتنەوەی یەکگرتووی کوردستان کاریان دەکرد .
نهێنیەك نادرکێنم گەر بڵێم ڕژێم هەستی بەوە کردبوو، کە (ی.ن.ك) خەریکی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشە هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٧٥ شەهید عومەر دەبابەیان ڕاسپارد کە بچێت لە شام لەگەڵ بەڕێز مام جەلال قسە بکات .. خۆ ئەگەر خوالێخۆشبوو کاك عومەر مستەفا قسەکانیشی بۆ خەڵك باس نەکرد گومان لەوەدا نیە حکومەتی عێراق هەر ڕاسپاردەی بۆ بەڕێز مام جەلال ئەوە

بووه، که بێتەوه پلەیەکی حکومی وەربگرێ‌و له عێراق دابنیشێ‌و کاری به سیاسەتەوه نەبێت ..
وەڵامی مام جەلال لەلای هیچ کەسێك شاراوه نەبوو، که بەقسەکانی حکومەت ڕازی نیه .. !

به هاتنی ئەو هەڤاڵانەی، که له سەرەوه باسم کردن بۆ چیاکانی کوردستان خەڵکی به شەرەفی کوردستان جارێکی تر دڵخۆشی خۆیان نیشاندا، ئیتر جەماوەری کوردستان باسکی بەهێزی پەیدا کردەوەو هەر وەکو دەڵێن : ئەگەر کورد چیاو تفەنگ‌و تێکۆشەری نەبوایه لەمێژه ناوی له کوڵەکەی تەریشا نەما بوو .

(ی.ن.ك) که پێشتر له چەند کەسێکی تێکۆشەرو کۆمەڵه پێك هاتبوو به هاتنی بزووتنەوەی کوردستان بەهێزترو توندوتۆڵتر بوو بەرامبەر دوژمنان .



## شەهید فەقێ عوسمان گۆمەشینی

### ناسراوە بە ـ مام فەقێ

شەهید لە ساڵی ١٩٥٦ دا لە گوندی گۆمەشینی سەربە شارۆچکەی کۆیە چاوی بە کوردستان هەڵهێناوە ، شەهید بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە، شەهید تا پۆلی شەشەمی ئامادەی خوێندووە، لە سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان پەیوەندی بەرێزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کردووە .

لە ١١/ ٥/ ١٩٧٧ دا شەهید لەلایەن ئەمنی ڕژێمەوە دەستگیر کرا دوای سێ مانگ ئازارو ئەشکەنجە (٥) ساڵ حوکم درا لە زیندانی ئەبو غرێب .

شەهید دوای ئازادکردنی لە ئەموزی ساڵی ١٩٧٩ دیسان پەیوەندی بە هەڤاڵەکانیەوە کردەوەو لەبەر لێهاتوویی‌و لێوەشاویی خۆی پلەکانی پێشمەرگایەتی بەزوویی بڕیوە تا بۆتە فەرماندەی تیپی (٩٣)ی کۆیە ، بەشداری چەندین شەڕو داستانەکانی کوردستانی عێراق‌و ئێرانی کردووە بە تایبەتی لە شەڕەکانی گرتنی ڕەبیەکانی نێوان کۆیەو دێگەڵەو شەڕی بۆتێ‌و مەڵبەندی سێ‌و سەر جادەی کۆیەو تەقتەق ، سێ جار بریندار کراوە .

شەهید لە ئێوارەی ڕۆژی ٤/ ٧/ ١٩٨٦ لە کاتژمێر ٤٥/ ٦ گیانی پاکی سپارد بە خاک‌و نیشتمانەکەی لە گوندی (کانی بی) دەشتی کۆیە گەیشتە کاروانی نەمران، بەمەش تاجی نەمری سێیەمین شەهیدی بنەماڵەکەیان دەخاتە سەرسەری .

شەهید کوڕێک‌و کچێک بە ناوی (هەکاری) و (گران) دەکاتە دیاری کوردستان .



شەهید فەقێ عوسمان گۆمەشینی ناسراوە بە ـ مام فەقێ

## شەهید عەلی سالح

شەهید عەلی سالح لە عەشیرەتی (دەربەندیە)، کە سێگردکانو ئۆمەر گومەت دوو گوندی ناوداری ئەو عەشیرەتەن لە ناوچەی تەقتەق . باوکی تەنیا کاك عەلی لەدوای خۆی بەجێ هێشت بوو .

شەهید لە گوندی کانی سلێمانە بەجوتیاری ژیانو گوزەرانی دایكو مندالەکانی دابین دەکرد لە پاشان بوو بە کرێکار لە کارگەی جگەرەی هەولێر .

شەهید لە سەرەتای سالی ١٩٧٧ لەسەر داوای ڕێکخستن پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد .

شەهید کادرێکی لێوەشاوەو ئازای شۆڕشی لێدەرچوو، لە ژیانی پێشمەرگایەتی زۆربەی ناوچەکانی هەولێرو سلێمانی گەڕایەوە .

شەهید فەرماندەی کەرت بوو لە دەشتی کۆیە لە پاشان کرا بە جێگری فەرماندەی هەرێمی کەرکوك .

لە ڕۆژی نەورۆزی ١٩٨٢ لە شەرێکی نا بەرامبەر لە ناوچەی سالەیی لەلایەن کۆپتەرو جاشەکانی ڕژێم ئابلوقە دران، پاش ئەوەی چەندین لاشەی دوژمنیان خستە گۆڕەپانی شەڕەکە، پاش شەهید بوونی (٥) هاوسەنگەری، پێی ئەستەم بوو بە بریندراری بەدیل بگیرێو بۆ ئەوەی وشەی پێشمەرگە بە پیرۆزی بمێنێتەوە بە چەکی خۆیو بە دەستی خۆی ، خۆی شەهید کرد .

شەهید دوو کوڕو کچێكو دایكو خێزانی لە گوندی کانی سلێمانە ماوە پاش چەندین سال کوڕە گەورەکەشی (کاوە) لەلایەن دوژمن لە سێدارە درا .

## شەهید محەمەد زەنگەنە

بەهۆی ئەوەی ناوچەکانی زەنگەنەو گەرمیانەکانی کوردستان ببوە مایەی چاوچنۆکی دوژمن‌و تەعریب دەکرا خێزانەکەیان بە ناچاری لە شاری هەولێر نیشتەجێ بوون، کاکە محەمەد بوو بە کرێکار لە کارگەی جگەرەی هەولێر وەکو ئەندامێکی دڵسۆزو کارامەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کاری دەکرد، بوو بە لێپرسراوی قەزاو ناحیەکانی سنووری هەولێر لە ١١/٥/١٩٧٧ فەرمانی گرتنی لەلایەن میری دەرچوو پاشان دەستگیرکرا ، زۆر مەردانە لە زیندان بەرگری لە مافەکانی گەلی کورد دەکرد لە ئەنجامدا بە ئیعدام حوکم دراو لەگەڵ هەڤاڵەکانی تری بەعسیەکان لە سێدارەیان دان . پێش دەستگیرکردنی بە چەند ڕۆژێك ژنی هێنابوو .

## شەهید ستار سادق

لە گوندی سەرمەزاری (مەنتك) لە ناحیەی قوشتەپە لە دایك بووە. براكانی پەیوەندیان بە شۆڕشی ئەیلول كرد، زۆر ئازایانە لە ڕیزەكانی سوپای شۆڕشگێڕی كوردستان بە رەنگاری دوژمن بوونەوە .

كاك سلێمان سادقی برا گەورەی كاك ستار لە ساڵی ١٩٦٩دا بەچەكە دژە ئاسمانیەكان فڕۆكەیەكی دوژمنی خستە خوارەوەو لەلایەن بارەگای بارزانی خەڵات كراوە .

تا هەر سێ شۆڕشی ئەیلول چوار براكەی تری سلێمان‌و محەمەدو ئەحمەدو فەتاح لە شەڕكردندا لەگەڵ میری شەهید كران . دایكیان لەلایەن دوژمن شەهید كراو لە پاشان سووتاندیان .

شەهید ستار لە شۆڕشی ئەیلولدا معاون سەر لق ئیسناد بوو لە هێزی دەشتی هەولێر .

لە ساڵی ١٩٧٧ دا كاكە ستار پەیوەندی بە بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلەكەمان كرد لەبەر ئەوەی تەنیا ئەو كوڕە لە بنەماڵەكەیان مابوو ناچار كرا، كە بگەڕێتەوە هەولێر بەڵام دوژمن پێی زانی‌و دەستگیر كرا پاش ئەشكەنجەو ئازارێكی زۆر لەلایەن دادگای ناعادیلانەی بەعس ئەمری لە سێدارەدانی درا لە ٢٨/ ٧/ ١٩٧٧ لە سێدارە درا .



شەهید ستار سادق

## شەهید عوسمان گچکە
## ( قوت )

شەهید کرێکارێکی بە جەرگی جگەرەی هەولێر بوو، لە ڕۆژانی سەخت و دژوار لەو ڕۆژەی کە کەم کەس دەیتوانی ناوی میللەتی خۆی بە ڕەوانی بهێنێ کاک عوسمان بە گەرمی کرێکارەکانی کارگەی جگەرەی وشیار دەکردەوەو ڕێکی دەخستن .

شەهید لێپرسراوی چەندین شانەی ڕێکخستنی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو .

شەهید وەکو کادیرێکی لێوەشاوە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەکرد .

لە ڕۆژی ١/ ٥/ ١٩٧٧ دا کاتێك بەعسیەکان یادی جەژنی کرێکارانیان دەکردەوە هاوڕێ عوسمان زۆر داوای لە ئێمە کرد خۆپیشاندانێکی گەورە بکەین دژی ڕژێم بەڵام لەلایەن ڕێکخستنەوە ئەو پێشنیارەی ڕەت کرایەوە .

لە ڕۆژی ١١/ ٥/ ١٩٧٧ دا کاك عوسمان لەلایەن ڕژێم دەستگیر کراو زۆر بە نامەردانە ئازاریان داو هەموو نهێنیەکانی ڕێکخستنی پاراستو هەر لەو پێناوەش گیانی خۆی پێشکەش بە گەلو نیشتمانە زەوت کراوەکەی کرد .

لە ڕۆژی ١٣/ ٥/١٩٧٧ پاش ئەوەی دوژمن سوودی لێوەرنەگرت هەموو ئەو کەسانەی بە درۆ خستەوە کە بەرەو ڕووی کرابوونەوە بەڵام بەداخەوە لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا شەهید بوو .

شەهید عوسمان نموونەی خۆڕاگری زیندانەکانی بەعسی فاشیەکان بوو .

## شەهید حەیدەر جوکل

شەهید لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەری ناودارە، یەکێك بوو لەو تێکۆشەرانەی بۆ بەعسیەکان مۆری نەکرد .

شەهید لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷٦ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەو یەکێتی کرد، ئەو کات فەرمانبەر بوو لە دائیرەی کشتوکاڵی (زراعە)ی قوشتەپە .

شەهید حەیدەر چەندین ساڵ بەکاری ژێر زەمینی ریزەکانی شۆڕشی دەوڵەمەند دەکرد .

شەهید لە ساڵی ۱۹۸٥ بە هۆی چەند خۆ فرۆشێك کەوتە داوی دوژمنانو ئازایانەش لە فاشیستەکان مەردانە بەرگری لە خۆیی و هاورێکانی کردو هەموو نهێنیەکانی پاراست .

شەهید بەراستی ماموستای خۆراگری بووە لە زیندان، پاش راپەرین دەقی لێکۆڵینەوەی شەهید حەیدەر کەوتە دەست هاورێیانی لەوێ خۆراگری شەهید جێگای سەرنجی هەموو کەسێکە.

ئەو تێکۆشەرە لەلایەن رژێم لە سێدارە درا .



شەهید حەیدەر جوکل

## چۆنیەتی دامەزراندنی
## بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان

ئەو ڕێکخراوە : لە هەلو مەرجێکی ناسكو ئاڵۆز دامەزرا تاکو ئێستا جەماوەری گەلەکەمان لە بارو دۆخو کاتی دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە ئاشنایەتی تەواوی نیە .

مێژوو، ناساندنی ئەو ڕێکخراوە کاری خودی کادرو ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە خۆیەتی بەڵام لە باسێکی وا مێژوویی ناکرێ وا بە ئاسانی لەسەری بدوێین .

کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان، کە لە پاشان بوو بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە ١٠/ ٦/ ١٩٧٠ دا لە دایك بوو هەڤاڵێ مام جەلال و کاك نەوشیراون و خالە شەهاب دەوری کاریگەریان هەبووە لە دامەزراندنی تاکە ڕێکخراوی سیاسی شۆڕشگێری کوردستانو کە بوو پاش ئاش بەتاڵ بە ڕەنگاری سیاسەتی ڕژێمی بەعس بوەوە، کادرو ئەندامانی چالاکانە کەوتنە کاری سیاسی، تەنزیمی وە پاش ماوەیەك چەکداری .

کۆمەڵە لە دامەزراندنی (ی. ن. ك)دا دەورێکی کاریگەری هەبوەو لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان گرەوی یەکەمی بەخۆی بەخشیوە، بە درێژایی ساڵانی خەبات لە شاخەکانی کوردستان لە سەنگەرەکانی پێشەوە سەکردەو کادرو پێشمەرگەکانی فیداکاریان کردووە کۆمەڵە هەمیشە نەیویستووە گۆڕەپانی خەبات بۆ خۆی پاوان بکات ئامێزی بۆ هەموو تێکۆشەران والا کردبوو، کە بێن بەیەکەوە گەلەکەمان لەو ڕۆژە ڕەشە ڕزگار بکەن .

بزووتنەوەی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان یەکەمین ڕێکخراو بوو بە پیر بانگەوازەکە هاتو لە ڕێزەکانی (ی. ن. ك)دا شان بە شانی کۆمەڵە خەباتی چەکداری گەرم کرد .

دەبا بزانین بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان.. چۆن هاتە مەیدان ..؟

پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول دەستەیەك لە تێکۆشەرانی گەلی کورد هەر زوو کەوتنە دروست کردنی ڕێکخراو یا حزبێکی تر.. (دیارە ئەو برادەرانە دەوری کۆمەڵەیان ئەوەندە بە هەند هەڵ نەگرتبوو) .

بۆ ئەوەی لەو دۆخە ئاڵۆزەی کوردستان بۆشای پەیدا نەبێت، وەکو لە هەندێ برادەرم بیستووە .. یەکەمین دانیشتنی ئەو دەستە تێکۆشەرە لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٥ لە شاری ڕەزاییەی کوردستان ئەودیو کراوە زیاتر لە (٣٠) کادری پێشەوە پارتی تیادا بەشداریان کردووە .. لەوانە: شەهید عەلی عەسکەری، شەهید د. خالید ، شەهید عەلی هەژار، شەهید کاردۆ گەلالی،کاك

جەمال ئاغا، کاک کەمال محێدین، کاک ڕەسوڵ مامەند .. هتد دیارە لەو کۆبونەوانەو دانیشتنەکانیان هیچ بڕیارێکی گرنگیان نەدا .

پاش هەڵ سەنگاندنی دۆخی ئەو کاتی کوردستان بیروبۆچونی جیاجیا لەناو ئەو کۆبوونەوەیە زۆربەیان بڕیاریان وابوو دەبێ بە زوویی حزبێك لە کوردستان دروست بکرێت . چونکە بە بڕوای من ئەوان پارتی ڕێکخستنەکانی هەڵتەکاوە ئەگەر لەگەڵ میریش هاوکاری بکەن یان بە ڕوونتر بڵێم (مفاوەزات) دەست پێبکەن ڕەنگە حکومەتیش هەندێ کەسی هان دابێت بۆ ئەو مەبەستە خاوەنی ئەو بیروبۆچوونانە بیانووی ئەوەیان دەدۆزیەوە بێ ئاگا لەوەی کە حکومەت ڕازی نەبوو لەگەڵ مەکتەبی سیاسی پارتی (مفاوەزات) بکات پاش ڕێککەوتن نامەی جەزائیر هەر چەند م. س پارتی خۆی بە فەرمی داوای لە حکومەت کرد وەڵامی حکومەت نهێنی نەبوو ، بەڵکو بە ئاشکرا لە ئێزگەی بەغدا وتی : ما يسمى بالمكتب السياسي للحزب الديموقراطي الكردستاني داوای مفاوەزات دەکات .. ئێمە ڕازی نابین تەنیا دەبێ ئاڵای سپی هەڵبکەن ، واتە دەبێ خۆیان بدەن بەدەستەوە .

ئەگەر حکومەتی عێراقی لەگەڵ هێزێکی وەکو پارتی خاوەنی سەد هەزار چەکدارو ئەو هەموو جەماوەرە زۆرە بێ نەی کات چ عەقڵێك بڕوا دەکات داواکاری چەند کادرێکی ئەو حزبە لەسەر داواکانی گەلی کورد ڕازی بکات ..! (إنقاذ مايمكن إنقاذه) ببوە بەرەی سیاسەتی ئەو چەند هەڤاڵنە دیارە حکومەت گوێی بەو داوایە نەدا .

تاکو یەکەمین بڵاوکراوەیان لە ١٦ ی ئابی ١٩٧٦ دەرکرد ئەو چەند تێکۆشەرە لەسەر چەند مەسەلەیەك یەکیان گرتەوە بەیانەکە بە ناوی (بزووتنەوەی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان) دەرچوو .

دەستەی دامەزرێنەری ئەو بزووتنەوەیە هەتا لەناو ئەندامو لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوەش یەك بیرو بۆچوونیان نەبوو جیاوازیەکی زۆر لەنێوانیاندا دەبینرا لەناو بزووتنەوە ئیتجاهی جیا جیای تیابوو هەندێك بیرباوەڕی مارکسی - لینینی، هەندێك سۆسیالیستی، دیموکراتیو هەندێ کەس قەومی ڕووت .. هتد . کۆبونەوەی ئەو هەموو بیروباوەڕە لەناو ڕێکخراوێکی ساوای ئەوها لەو دۆخە ئاڵۆزەی کوردستان زۆر گیروگرفت دروست دەکات لە ئەنجامدا تووشی پارچە پارچەییو پەرشو بڵاوی دەبێت .

هەر بۆیەش لەناو بزوتنەوە تاکو ئێستا چەند تاقمو گروپی لێ جیا بۆتەوە تا بزوتنەوە هەردوو تێکۆشەر شەهیدان عەلی عەسکەریو د. خالید وەکو سەرکردە بوون دۆخەکە باشتر دەڕۆیشت

چونکە دوو پیاوی ناوادارو ڕابەردووی خەباتی دلێرانەیان هەبوو، تاقمەکانی تر لە هەوڵ‌و تەقەلاکانیان شکستیان دەخواردو پوچەڵ دەبوونەوە چاوەڕوانی هەلی لەبار تریان دەکرد .

جگە لەو ناکۆکیە فکریانەی کە لە پێشەوە پەنجەمان بۆ ڕاکێشا هەندێك لە سەرکردایەتی بزووتنەوە گونجانیان لەگەڵ یەکتر زۆر ئاستەنگ بوو .

دوو باڵەکەی پارتیش دەوری کاریگەری هەبووە بۆ نانەوەی پشێوی لە ڕیزەکانی بزووتنەوە .

شەهید سالح یوسفی ڕابەرو سکرتێری بزووتنەوە بوو، پیاوێکی خاوەن هەڵوێست‌و ڕاستگۆ بوو، خۆشەویستی جەماوەری گەلەکەمان بوو، لەگەڵ میللەتەکەمان جیانەدەبوەوە، لە خۆشی‌و ناخۆشی لەگەڵ ئەوان دەژیا، پێی نەنگ بوو بچێتە ئێرانی شا چونکە بە پلانی ئەو نامەردە کورد تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە بوو بۆیە پێش خەلکی ڕەش‌و ڕووت کەوت‌و هاتەوە عێراق لە پاشان بەدەستی ناپاکی بەعسیەکان شەهید کرا .

شەهید سالح یوسفی زۆر دەوری کاریگەری نەبوو لەسەر ئەو سیاسەتەی بزووتنەوە چاکتر بڵێم لەسەر پیادەکردنی سیاسەتی بزووتنەوە، چونکە هەڤاڵەکانی زۆربەیان لە شاخ بوون ئەویش لە بەغدا لەژێر چاودێری ڕژێمدا بوو شەهید سالح یوسفی بڕوای بە سیاسەتی (الباب المفتوحة) هەبوو واتە هەمیشە دەرگا کراوەبێ ئەگەر حکومەت ویستی (مفاوضة) بکات دەبێ شۆڕشی کوردستان ئامادەیی تیابێت، بەڕای من ئەو کات لەو هەوڵ‌و مەرجەی سالانی حەفتاکان سیاسەتێکی باش بوو، کۆبوونەوەی ئەو هەموو بیروڕا جیاوازە هەلوەشانەوەیە، شەهید بوونی سەرکردە ناودارەکانیان زەمینەی زیاتر خۆش کرد . نەك هەر لەناو (ی. ن. ك) چوونە دەرەوە بەلکو لەناو خۆشیان بوون بە دوو ڕێکخراو ، وا ناوبانگ دەرکرا، کە هەندێك باڵی ڕاست‌و ئەوانی تر باڵی چەپ، پێم وایە شتی وانە بووەو بەلکو لە ڕاستیشدا کاریگەری کۆنە (مەلایی‌و جەلالی) دەوری زۆری هەبوو بۆ لێك ترازانی ئەو ڕێکخراوە . ڕێژەیەکی زۆر کەمیان لەناو (ی. ن.ك) دا مانەوە بەبێ ئەوەی هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتیان لەگەڵ بێت‌و زۆربەیان لەگەڵ کاك ڕەسوڵ مامەند بوون لێرەدا یەك مەسەلەی گرنگ هەیە، کە پێویستە بخرێتە ڕوو: -

د. مەحموود عوسمان لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا (لیژنەی تحظیر)ی دامەزراند بۆ ماوەیەکی زۆریش هیچ کەس باوەڕی بە حزبەکەی نەدەکرد ناکۆکی ڕیزەکانی (ی.ن.ك)ی بە هەل زانی ئەو هەلەی قۆستەوەو دەوری خراپی گێڕا بۆ ئەوەی کاك ڕەسوڵ مامەند لەگەڵ یەکێتی تێك بچێت، د. مەحموودیش چووە ناو باڵی کاك ڕەسوڵ مامەند بەبێ ئەوەی هیچ بیانویەکی هەبێت ئەویش خۆی قاچاغ کردو چووە گوندێکی ئێران بە ناوی (گۆڕەشێر) .

د. مەحموود نیازی ئەوەبوو، کە ببێتە سەرۆکی بزووتنەوەو پارسەنگێك دروست بکات کەچی لەویش دیسان کارەساتێکی تری بەسەر ئەو بزووتنەوەیە هێناو لێیداو رۆیشت چوو بۆ سووریا .

بەرێز مام جەلال بۆ زیندوکردنەوەی بزووتنەوە داوای لە کاك عەلی حەوێز کرد، کە سەر لەنوێ رێکخستنەکانی بزووتنەوە زیندو بکاتەوە لیژنەیەکی ئامادەکردنیان لە کاك عەلی حەوێزو کاك عەزیز بەگ پێك هێنا بە یارمەتی بەرێز مام جەلال پاش چەندین مانگ نوێنەریان لەناو (ی. ن. ك)دا دەستی بەکار کردەوە، پاش ئەوەی شا هەلاّت‌و (ئیمام خومەینی) هاتەسەر کار ، سوارە عەباس ئاکۆ لە ئێران هاتەوەو بووە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە ..!، بەرە بەرە هەندێك لە کادرەکانی بزووتنەوە هاتنە ناو ریزی شۆرش لە پێشەوە کاك جەمال ئاغا، کە کرا بە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە لە پاش ئەویش مامۆستا شەریف‌و حاکم عومەر مامۆستا هەندرێن (عەلی عەبدوللا )وە مامۆستا یوسف کەرکوکی ، لەسەر داوای رێکخستن مامۆستا نازم پەیوەندی بە شۆرشی چەکداریەوە کرد لە سەرەتای سالّی ۱۹۸۱ چەندین کادری تری بزووتنەوە لە شاخ‌و دەشتەکان دەستیان بە بوژاندنەوەی رێکخستنەکانیان کرد لەوانە مامۆستا عەبدوللاو مامۆستا سالح‌و مامۆستا کەریم .

لە کۆبونەوەیەکی خۆرێکخستنەوە ئەم هەڤالَنەی ناویان لە خوارەوە هاتووە بە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە هەلّبژێردران: ـ

١. کاك عومەر مستەفا .
٢. مامۆستا عەلی حەوێز .
٣. کاك جەمال ئاغا .
٤. مامۆستا نازم .
٥. حاکم عومەر .
٦. مامۆستا کەریم .

بەرێزان جەمال ئاغاو عەلی حەوێز بوون بە نوێنەری بزووتنەوە لە مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك). لێکهەلّوەشانی بزووتنەوە هەم زەبرێکی کاریگەر بوو لە (ی.ن.ك) کەوت هەم زەبرێکی کاریگەریش بوو لە بزووتنەوە کەوت .

هیچ بالّێکیان نەیتوانی وەکو خۆی بمێنێتەوە، تووشی دەیان گێوگرفتی سیاسی، رێکخستن، فیکری بوون، بالّەکەی کاك رەسولّ مامەندیش تووشی شکستی گەورەتر بوو ، دەردە دکتۆری وەکو ئێستاش کە پێوەی دیارە چەندین کادریان بەیەك جاری وازی هێناو بالّێکی تر بە ناوی

حزبی ئاستەنگکێشانی کوردستان بەرابەری هەڤاڵ قادر عەزیز، کە لە باشترین کادیرانی بزووتنەوە بوو لێی جیابوونەوە، حزب پێک هاتووە لە کۆبوونەوەی چەند کەسێک، کە خاوەن یەک بیروباوەڕو یەک ئامانجو یەک ستراتیژو یەک فکر پێک هاتووە نەک وەکو لە پێشەوە باسمان کرد، کە لەسەرکردەکانی بزووتنەوە بەدی دەکرا .



## پارتی دیموکراتی کوردستان

## لیژنەی تەحزیری

پاش ئەو شکستە گەورەیەی شۆڕشی ئەیلول سەرکردەکانی پارتی هەریەکە ئۆباڵەکەی دەخستە ملی ئەوی تر بێتەوەی هەڵسەنگاندنێکی بابەتی بکات .. شکستی شۆڕشی ئەیلول زۆر باس‌و خواستی لەسەر نووسراوە، بەڵام یەك راستی هەیە، کە ڕەوای هەقە بیلێم : هەندێ کەس پەنجەی شکانی شۆڕشیان تەنیا بۆ سەرۆك بارزانی نەمر درێژ دەکرد من بە پێچەوانەوە دەڵێم بارزانی هەموو تەمەنی لە ڕێگای هێنانەدی ئامانجەکانی گەلی کورد تەرخان کرد گەلێك گیروگرفت‌و دەربەدەری تووش هات ڕەنگە ئەویش بەشی خۆی بێبەش نەبێ، بەڵام ئەوە واتای ئەوە نیە، کە سەرکردایەتی شۆڕش بە تایبەتی مەکتەبی سیاسی ئۆباڵی شکستەکە هەڵناگرێ ، د. مەحمود عوسمان‌و کاك سامی پاش ئەوەی چەندین ساڵ سەرۆك بارزانیان بە ڕەمزی کورد دەزانی‌و هەریەکە کورسیەکیان گرتبوو لە م.س پدك بەهیچ جۆرێك بۆ خەڵکی تریان چۆڵ نەدەکرد پاش ئەوەی شۆڕش شکستی هێنا کەوتنە هاویشتنی تفی سەر هەوراز بێئەوەی لە ڕابوردووی خۆیان ووریا بن دەستیان کرد بە هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئەیلول وایان ئەژمار دەکرد ئەوان هیچ ڕۆژێك بەشداری شۆڕشی ئەیلولیان نەکردووە بەهەر حاڵ ڕووداوەکان باشتر مەسەلەکەیان چاکتر روون کردەوە .

کاك سامی تا ساڵی ۱۹۷۹-۱۹۸۰ سکرتێری قیادەی موئەقەرگیزەی پدك بووە بە سەرۆکایەتی هەڤاڵی بەڕێز کاك مەسعود بارزانی . کاك د. مەحمود چووە سوریا لەگەڵ چەند کەسێك ئەو حزبەیان دامەزراند (الحق) زوو هاتەوە ناو شۆڕش پێش کارەساتی (هەکاری) ساڵی ۱۹۷۸لە خرێی ناوزەنگ بوو، هەموو پێشمەرگەکانی لە (۲۰ تا ۳۰) کەس تێنەدەپەڕی لە هەموو پارێزگای هەولێر تەنها کاك جەعفەر حوسێن خەڵکی گردە سوور لەگەڵ ئەوبوو، وە لەلایەن بەڕێز مام جەلال زۆر ڕێزی لێگیراوە هیچ بڕیارێکی سیاسی نەدەدرا ئەگەر کاك د. مەحمود ئاگای لێ نەبوایە ..

# قەندیل بەغدای هەژاند

چیای قەندیل لە مێژووی میللەتەکەمان شوێنێکی بەرزو گرنگی هەیە، شۆڕشگێڕان بە پشتیوانی چیای قەندیل هەمیشە دوژمنیان بە هیچ نەزانیوە .

قەندیل لەگەڵ نەهامەتیو کارەساتەکانی کورد ژیاوە هەر لە ڕۆژانی ڕەش بە هانای هاتووە، بەرگری لەمانی کوردستان کردووە، بەرگری تۆپو فڕۆکەی گرتووە .

ئەگەر چیای سەفینو ئاوەگردو کارۆخو هەندرێنو زۆزکو مەتینو شیرینو پیرەمەگرونو ئەزمەڕو حاجی مامەندو قەرەداخو کێوەڕەشو گاراو پیرسو هەلگورد لە ڕۆژانی بەهێزی شۆڕش سەنگەری پێشمەرگە بووبن، قەندیل بە تەنیا لە ڕۆژانی تەنگو ئالۆزو مەترسی سەنگەری توندو تۆڵی (ه.پ.ك) بووە ..!

قەندیل لە سەرەتای شۆڕشی ئەوجارەی گەلەکەمان جێگای کۆبوونەوەی پێشمەرگەو بنکەو بارەگای سەرکردایەتی بووە لە کارەساتی هەکاری تێکۆشەرانی لە مردن (محقق) ڕزگار کردووە ، هەر بناری قەندیلی سەربەرزبوو هەڤاڵن مام جەلالو کاك نەوشیروان ئەو دوو تێکۆشەرەی پاراستو لەوێوە شۆڕش هەنگاوی مەردانەی ناوە لە شکستەکەی ساڵی ۱۹۸۸ قەندیل هەزاران پێشمەرگەی لە ئابلۆقەی دوژمن ڕزگار کردوو لاشەی سەدان فاشستی کردە خۆراکی داڵو قەل ، وەفاداری چیای قەندیل لەباس کردن نایەت، ئەوەندەی بەسە کە یەکەمین شەڕی بەرەیی بۆ چەندین ڕۆژ لە بەهاری ۱۹۷۷ لە کەلەکی باڵەییان، دۆڵی باڵەییان گۆمی کرمە سۆران ، شێخ ئەحمەد ناسر، شێخ شەڕو، بەرامبەر دوژمن کرا لەوێ ترسی جەماوەری گەلەکەمان بەرامبەر دوژمن شکا چونکە پێشمەرگەکان سامی بەعسیەکانیان شکاند .

پاش ئەوەی لە هەورامانو جافایەتیو شار بازێڕ لە تەمووزی ۱۹۷٦ مەفرەزە سەرەتاییەکانی (ی. ن. ك) و کۆمەڵە بڵاوبونەوە لە کۆتایی هاوینی هەمان ساڵ تێکۆشەران عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری، د. خالید، سەعدی گچکە، قادر عزیز ، قادر مستەفا، مەلای حاجی ڕەسوڵی کەرزۆری، سەید کاکە، لە ناوچەکانی هەولێر دەستیان کرد بە شەڕی پارتیزانی لە پایزی ۱۹۷٦ مەفرەزەکانی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) گەیشتنە ناوچەکانی خۆشناوەتیو دەوروبەری کۆیەو زرارەتیو دۆڵی سماقوڵیو زۆر شوێنی تر .

سەرکردایەتی ناوەوەی وڵات دامەزرا شەهید ئارام سکرتێری گشتی کۆمەڵە سەرپەرشتی مەفرەزە سەرەتاییەکانی دەکرد .

هەڤاڵنی بزووتنەوە بەهۆی ئەوەی هەندێك لە هەڤاڵنیان ناودار بوون لەناو خەڵكو لە شۆڕشی ئەیلول دەوریان هەبوو .. ئەو كەسانەی، دەهاتنە ڕیزی پێشمەرگایەتی پەیوەندیان بەو هەڤاڵنەوە دەكرد لە سەرەتا.. كۆمەڵە لە ناوچەی هەولێر ژمارەیەكی كەم لە ئەندامو لایەنگرانیان لە ڕێزی هێزی پێشمەرگە بوون، بۆ ئەوەی جەماوەری میللەتەكەمان لە شێوەی ڕێكخستنەكانی هێزی پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕش بزانن بە پێویستم زانی شێوەی ڕێكخستنەكە بنووسمەوە:-

هەموو پارێزگای هەولێر و سلێمانی و كەركوك كرابوونە دوو هەرێم لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ هەڤاڵ عەلی عەسكەری فەرماندەی هەرێمی سلێمانیو كەركوك بوو، هەڤاڵ د. خالید سەعید فەرماندەی هەرێمی هەولێر بوو، لە پاش هەرێم كەرتی پێشمەرگە لە پاش كەرت (مەفرەزە) .

مەرج نەبوو هەرێم لە چەند كەرت پێك دەهات، بە گوێرەی لێوەشاوەیی هەندێ تێكۆشەر ژمارەی ئەو كەسانە بوو كە دەهاتنە ڕێزی شۆڕش .

بۆ نموونە لە باوەجی تا قەرەچۆخ یەك كەرتی پ. م هەبوو لەلایەن شەهید سەعدی گچكە سەرپەرشتی دەكرا، كە پێك هاتبوو لە چەند مەفرەزەیەك (كاك قادر مستەفا، جەلالی كوێخا ڕەفیق كە لە پایزی ١٩٧٧ دا خۆی تەسلیمی ڕژێم كردەوە، كانەبی چاوشین، كە لە حوزەیرانی ١٩٧٧ دا ئەویش خۆی تەسلیم كردەوە .

هەموو ناوچەی خۆشناوەتی یەك كەرت بوو لەلایەن هەڤاڵ سەید كاكە سەرپەرشتی دەكرا فەرماندەی مەفرەزەكان (مەلای حاجی ڕەسوڵ، سەلیم كیشكەیی، سلێمان بێرێژی، مەلای مەلا قادر، كە لە پاشان هەڵگەڕایەوە داوە كوێخا ڕەسوڵ بێتواتە، كە ئەویش خۆی تەسلیم بە ڕژێم كردەوە .

هەموو پێشمەرگەكانی ناوچەی هەولێر لە دووسەد هەتا سێ سەد پ. م. تێنەدەپەڕی، ئەو ژمارەیەش لە كەم بوون دابوو لە درێژەی ئەو باسە ئەو ڕاستیە دەردەكەوێ : لە پەنا چیای قەندیلیش دەیان تێكۆشەر كورەی خەباتیان گەرم و گەرمتر دەكرد هەڤاڵن قادر خەباتو مەحمود سەیدەو مارفە ڕەشو خدر سۆفی مەلاو ئەحمەد مەولودو قادری حاجی ڕەسوڵو دەیان تێكۆشەری تری ڕاستەقینەی گەلەكەمان بوون، لە مێژووی شۆڕشی گەلی كوردستان بەو پێشمەرگانە دەگوترێ مەفرەزە سەرەتایەكان، كە لە ڕۆژانی یەكەمدا بە ڕەنگاری دوژمن بوونەوە تاكو هاوینی ١٩٧٨.

لەو کەین و بەینەی حکومەتی کوردستان زۆر باس و خواست دەکەوێتە ئاراوەو وەختە ئەو تێکۆشەرانە لەناو ئەو حەشامەتە بزربن چونکە نەخۆیان مێژووی خۆیان نووسیوەتەوە وە نە ئەوانەش مێژووەکە دەنووسنەوە کە بەرژەوەندیان تیادا نەبێت .

من لە ناوچەکانی هەولێر هەر زوو پەیوەندیم کرد بە پارتیزانەکان یان باشتر بڵێم مەفرەزە سەرەتایەکان بۆیە لێم مەگرن ئەگەر زۆرتر ناوی قارەمانانی ناوچەکانی هەولێر بنووسمەوە .

ئەوە بەو واتایە نیە ئەگەر ناوی تێکۆشەرێکم لەبیر کردبێت بەوە لێك بدرێتەوە، کە لە خەباتی کەم دەکەینەوە.. هتد .

نەخێر ڕۆڵی مەفرەزە سەرەتاییەکان ئەوەندە کاریگەر و بەرزە ئەوەندە وەفاداری گەل بوون بە هەق دەبێ نەك هەر مێژوو بۆ نەوەکانی دوا ڕۆژ جەربەزەیی و ئەمەکداریان بگێڕێتەوە بەڵکو هەمیشە میللەتەکەمان بە پشت و پەنای خۆیان بزانی لە ڕۆژانی سەخت، میللەت تا ئەو ڕۆڵانەی مابێت، خۆی بەبێ کەس نەزانێت .

من دڵنیام ئەو پارتی زانانە، ئەو پێشمەرگە مەفرەزە سەرەتاییانە هەر ڕۆژێك پێویستی کرد ، هەر کاتێك ئاسایشی نەتەوەی کورد کەوتە مەترسی، هەر کاتێك کار بەدەستانی حکومەت بیانەوێ زوڵم لە جەماوەر بکەن ئەو تێکۆشەرانە هەمان ڕێگای خەبات دەگرنەوە بەرو دیسان بە ڕەنگاری ئەو کەسانە دەبنەوە، کە دەیانەوێ زۆرداری لە میللەتەکەمان بکەن .

نابێ تا سەر ئەو کەسانەی دەیانەوێ لەسەر حیسابی میللەتی ئێمە بژین دڵخۆش بن چونکە کوڕانی مەفرەزە سەرەتاییەکان چاوەڕوانی ئیشارەتێکی گەلەکەمانن .. تاکو زۆرداری بن بڕ بکەن .

بۆ ئەم مەبەستە ناوی ئەو تێکۆشەرانە دەنووسم، کە لە مەفرەزە سەرەتاییەکاندا بوون :-

١. **شەهید ئارام .**
٢. **هەڤاڵ سالار .**
٣. **بەڕێز مام جەلال .**
٤. **بەڕێز کاك نەوشیروان مستەفا .**
٥. **شەهید عەلی عەسکەری .**
٦. **شەهید د. خالید .**
٧. **خوالێخۆشبوو عومەر مستەفا .**
٨. **شەهید تایەر عەلی والی .**

٩. هەڤاڵ مەلا بەختیار .

١٠. شەهید حسێن بابە شێخ یەزیدی .

١١. شەهید عەلی ساڵح .

١٢. هەڤاڵ عەلی شامار .

١٣. شەهید سەعدی گچکە .

١٤. هەڤاڵ سەید کاکە .

١٥. هەڤاڵ قادر عەزیز .

١٦. شەهید قادر مستەفا .

١٧. شەهید ئازاد هەورامی .

١٨. شەهید فاروق سدیق .

١٩. شەهید فەیسەڵ تاڵەبانی ( سیروان ) .

٢٠. شەهید حەمە غەفور ئاخجەلەری .

٢١. شەهید عوسمان لاوە .

٢٢. شەهید جەوهەر سەعید .

٢٣. شەهید سەرباز .

٢٤. شەهید شەماڵا .

٢٥. شەهید خەلیل .

٢٦. شەهید هاوار .

٢٧. شەهید مەجید ئەنوەر سوڵتان .

٢٨. شەهید سەید کەریم .

٢٩. شەهید مولازم حەسەن خۆشناو .

٣٠. شەهید مولازم جەمال .

٣١. شەهید عەباس .

٣٢. شەهید یاسین قادر .

٣٣. شەهید مەحمود سەیدە .

٣٤. شەهید خدر سۆفی مەلا .

٣٥. شەهید ئەبەز ( هەولێر ) .

٣٦. شەهید ئەبەز ڕەش ( سلێمانی ) .

٣٧. شەهید جەمالی عەلی باپیر .

٣٨. شەهید مەلای حاجی رەسوڵی کەرزۆری .

٣٩. هەڤاڵ سوڵتان دێهاتی .

٤٠. شەهید عەبدولڕەحمان سونە گولی .

٤١. شەهید سلێمان بیرێژی .

٤٢. هەڤاڵ رەسوڵ مامەند .

٤٣. هەڤاڵ د. مەحموود عوسمان .

٤٤. شەهید محەمەد عەجەم .

٤٥. شەهید شاخەوان .

٤٦. شەهید ڕێباز .

٤٧. هەڤاڵ ئازاد خۆشناو زیارەتیو هەڤاڵ شێرزاد خۆشناو ( تەسلیم بوونەوە ) .

٤٨. هەڤاڵ نەریمان ( تەسلیم بومەوە ) .

٤٩. هەڤاڵ حامید حاجی غالی .

٥٠. هەڤاڵ مام ڕۆستەم .

٥١. هەڤاڵ شێخ جەعفەر .

٥٢. شەهید شەوکەتی حاجی مشیر .

٥٣. هەڤاڵ سامان گەرمیانی

٥٤. هەڤاڵ عادل گەرمیانی .

٥٥. شەهید عەلی چوارتایی .

٥٦. هەڤاڵ حەمەی مام سەلام ( تەسلیم بومەوە ) .

٥٧. هەڤاڵ چەتۆی کەریمە سور .

٥٨. کانەبی چاوشینو خولەی برای ( تەسلیم بوونەوە ) .

٥٩. سەعدی شوشە ( تەسلیم بومەوە ) .

٦٠. جەلالی کوێخا ڕەفیق ( تەسلیم بومەوە ) .

٦١. شەهید سەلیم کێشکە .

٦٢. مەلای مەلا قادر ( تەسلیم بومەوە ) .

٦٣. کوێخا رەسوڵی بێتواتە ( تەسلیم بومەوە ) .

٦٤. هەڤاڵ عومەر ڕەش .

٦٥. قادر فەرەج ( تەسلیم بومومو پاشان بەدەستی پ. م کوژرا ) .

٦٦. حەمەی شێخ حەسەن بەفراوی ( تەسلیم بومومو پاشان بەدەستی پ. م کوژرا ) .

٦٧. تەحسین شاوەیس ( تەسلیم بووە ) .

٦٨. هەڤاڵ ئاوات قارەمانی .

٦٩. هەڤاڵ ئاوات .

٧٠. هەڤاڵ شۆڕش بچکۆل .

٧١. شەهید عەلی ئامەخان .

٧٢. هەڤاڵ دلێر سەید مەجید .

٧٣. هاوڕێ جەبار .

٧٤. هەڤاڵ حەمە سەعید .

٧٥. هەڤاڵ ئازاد سەگرمەیی .

٧٦. هەڤاڵ تاڵب ڕۆستەم .

٧٧. شەهید عەولا سوور .

٧٨. هەڤاڵ حاجی حاجی برایم .

٧٩. هەڤاڵ حەمەی مەلا شەریف .

٨٠. هەڤاڵ عەلی کو ( تەسلیم بوەوە ) .

٨١. خوالێخۆشبوو ئەحمەد نەبی ( تەسلیم بوەوە ) .

٨٢. شەهید سەید عەبدوڵلا .

٨٣. هەڤاڵ قادر خەبات .

٨٤. شەهید ئەحمەد فەقێ ڕەش .

٨٥. شەهید سەید حوسێن گۆمەشینی .

٨٦. شەهید حەمە تاڵ .

٨٧. شەهید نوعمانەگۆج .

٨٨. هەڤاڵ بەکر حەمە .

٨٩. شەهید کەریمە سوور .

٩٠. شەهید محەمەد سێ گرکانی .

٩١. شەهید حەوێز هیرانی .

٩٢. هەڤاڵ بەکری حاجی سەفەر .

٩٣. شەهید قادر عەولا .

٩٤. شەهید فارس خۆرخۆری .

٩٥. مولازم عەبدولمەلیك ( تەسلیم بوەوە ) .

٩٦. هەڤاڵ نادر هەورامی .

٩٧. هەڤاڵ نەسرەدین مستەفا .

٩٨. ئەبو عەنتەر .

٩٩. هەڤاڵ عەبدولڕەحمان بیداوی .

١٠٠. هەڤاڵ جەوهەر نامق .

١٠١. هەڤاڵ جەعفەر حوسێن .

١٠٢. شەهید سامی عەبدولڕەحمان .

١٠٣. عەبدولڕەحمان بیشەیی ( تەسلیم بوەوە ) .

١٠٤. خوالێخۆشبوو عەولا بەرزە ( لەبەر پیری تەسلیم بوەوە ) .

١٠٥. شەهید ئەسعەد ئاومالی .

١٠٦. شەهید عەلی ئاومالی .

١٠٧. عەباس کانی سلێمانەیی .

١٠٨. شەهید ئەحمەد قەمبەری .

١٠٩. هەڤاڵ مولازم عومەر عەبدوللا .

١١٠. هەڤاڵ برایم جەلال .

١١١. هەڤاڵ مامۆستا جەعفەر .

١١٢. هەڤاڵ عەولا بۆر .

١١٣. هەڤاڵ ئازاد مەریوانی .

١١٤. هەڤاڵ زیاد خۆرانی .

١١٥. شەهید عەزیزی رابی .

١١٦. مستەفا حاجی کوێخا ( تەسلیم بوەوە ) .

١١٧. شەهید برایمی حاجی کوێخا .

١١٨. هەڤاڵ ئازاد خەفاف .

١١٩. هەڤاڵ کەریم سنجاری .

١٢٠. خدر پشتاشانی .

١٢١. عەلی ئاغای بۆرەیی .

١٢٢. هەڤاڵ برایم ئەحمەد حوسێن .

١٢٣. شەهید هاورێ کاوە .

١٢٤. شەهید حوسێن شێوەلوکێ .

١٢٥. مام حەمید باتاسی .

١٢٦. نەبی چالاك .

١٢٧. مامەند مەنتك .

١٢٨. خالد گەرمیانی .

١٢٩. شەهید سەلاح موهەندس .

١٣٠. شەهید ئاشتی .

١٣١. شەهید شوان .

١٣٢. مەحموود حاجی فەرەج .

١٣٣. مەحموود گەرمیانی .

١٣٤. حەمید گەرمیان .

١٣٥. کاکە ڕەش .

١٣٦. دلێر شێخ بابا رەسوڵ .

١٣٧. میرزا گومەرمز .

١٣٨. شەهید بەختیاری باخ .

١٣٩. خوالێخۆشبوو نەسرین دەربەندی .

١٤٠. شەهید هیوا حەمە فەرەج .

١٤١. شەهید کاکە عەبە .

١٤٢. سەرکەوت بچکۆل .

١٤٣. شەهید سەیفەدین ئاوایی .

١٤٤. عەلی شیعە .

١٤٥. دکتۆر ڕەزا .

١٤٦. شەهید هاوڕێ .

١٤٧. غەفور دەرەشیشی .

١٤٨. مولازم فوئاد .

١٤٩. مولازم عەلی .

١٥٠. ڕەحمان ڕەشید .

١٥١. عومەر ئاغای دۆڵەمەڕی .

١٥٢. مولازم هەجەر .

١٥٣. سەید مورسل .

١٥٤. **ئەحمەد جەمیل .**

١٥٥. **غازی قادر ئاغای نازەنینی .**

١٥٦. **خدر سوارە .**

١٥٧. **وەستا یونس .**

١٥٨. **سەلاّح چاوشین .**

ئەوانە بوون ئالاّی ڕزگاری کوردیان بەرزکردەوە، ئەگەر بە وردی سەیری ناوەکانیان بکەن زۆربەیان وەفاداری خۆیان گەیاندە سەرو شەهید بوون .

ئەو تێکۆشەرانە لە هەموو حزبە سیاسیەکانن بەبێ جیاوازی، جا ڕەنگە هەندێك لە هەندێکی تر دەوریان زیاتر بێت بەلاّم بێگومانم زۆربەیان ئەوەی لە توانایاندا بوبێ کردوویانە بۆ خزمەتی گەلەکەیان .

ئەو چەند تێکۆشەرە .. یەکەم ترووسکەی شۆڕشیان هەلّگیرساندو پاشان بووە ئەو مەشخەلّە، کە هەموو دوژمنانی کورد نەك هەر لە توانایاندا نیە خامۆشی بکەن بەلاّم مەترسی لە خودی حالّی خۆشیان دەکەن، کە پریشکی ئەو مەشخەلّە هەموو تەختو تاراجی زالّمانەیان بسووتێنی.

یەکەمین بنکەی سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە خنجیلانەیە ئەو شۆڕشە دوژمن شکێنە، ئەو شۆڕشە خۆشەویستە، ئەو شۆڕشەی کە ئاواتی کوردی هێنایە دی لەبناری سەربەرزی چیای قەندیل بارەگای خۆی دامەزراند، بانگەوازی شۆڕشی نوێی ئەم جارە لەسەر لوتکەی قەندیل کەوتە گوێی سەرانسەری کوردستانی داگیرو لەت کراو.

ئەگەر دوژمن پێش دانانی بارەگای سەرەکی شۆڕش لە قەندیل، کە لە سەرەتای ١٩٧٧ دا دامەزرا هەموو پێشمەرگەکانی بەیاخی بوون لە یاساو بە چەند دزو جەردەیەك دانە نایە ئەوا لەو کاتەوە خەونەکانی دوژمنانو نۆکەرانو (جەبهەی تەقەدمی) بە پێچەوانەوە دەبوو .

لە چەندین شوێنی گرنگی کوردستان مەفرەزەکان دەستیان کرد بە چالاکی شۆڕشگێڕانە ، چەندین سیخوڕو بۆرە پیاوی بەعسیەکانیان لە خوێنی پیسی بۆگەنیان گەوزاند ، مەترسی کەوتە دلّو دەروونی هەموو دوژمنێکی کورد نەك هەر دوژمنانی کوردی کوردستانی خواروو بەلّکو دوژمنانی کوردستانی گەورەی ئازیزو داگیرکراو . دوژمن لەخۆ بایی‌و مل هوڕ بۆ چاو ترساندنی خەلّکی کوردستان دەستی کرد بە پڕوپاگەندە، کە لە بەهاری ١٩٧٧ هێرشێکی بەربلاّو دەکات تاکو هەموو ئەو یاخی بووانە بکوژێ‌و تەفرو تونایان بکات .

بەڵێ لە بەهاری ١٩٧٧ دوژمن بە هێزێکی یەکجار زۆرو بە فڕۆکەی کۆپتەر هێرشی کردە سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان، کە هێشتا شۆڕشەکمان ساوابوو هێشتا لە خۆسازداندا بووین، میللەتەکەشمان دڵنیا نەبوو، کە ئەو شۆڕشە لەبەر هێزی زۆرو پڕ چەکی ڕژێم خۆی رادەگرێ ..!

(هـ.پ.ك) بێ پشتیوانی دەرەوە بێئەوەی هیچ دەوڵەتێك لە سەرمان بە وەلام بێ، بەو چەکە کۆنانە بەو هێزە کەمە بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ پێشی لە هێزی عێراقی گرت و شەڕی سەنگەر بە سەنگەری لەگەڵدا کردن .. لە پشت ئاشان، قرناقاو، ئاش قولکەو سوورەدێ و دۆڵی بالەییان ئەو دۆڵەی دەیان شەهیدی پێشکەش بە خاکی کوردستان کردو دوژمن لەو شەڕە زەرەرو زیانی ماڵی و گیانی زۆری لێکەوت کۆپتەرێك پێکرا لە گۆمی کرمەسۆران کەوتە خوارەوە، لە پاشان (هـ.پ.ك) لەو شوێنانە کشایەوە چونکە لە پارتیزانیدا شەڕی بەرەیی ئەوەندە گرنگی نیە بەڵکو بەردەوامی شۆڕش و درێژە پێدانی .

ڕاستە لە شەڕی قەندیل دوژمن توانی بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی تێك بداو بڵاوە بە پێشمەرگەکانی بکا بەڵام شەڕ لەگەڵ دوژمن لەو هەل و مەرجە تایبەتییەی کوردستان چێژو تامێکی تایبەتی خۆی هەبوو، ئەو شەڕە لە هەموو سوچێکی کوردستان دەنگی دایەوە، ئەو ڕاستییە ئاشکرابوو ئەگەر میللەتێك بییەوێ داوای مافی خۆی بکات شەڕکردن لەگەڵ گەورەترین هێز نابێ ناکرێت نییە ..!

ئەوەی جێگای داخ و ناخۆشیمە زۆربەی هاوڕێکانم لە ڕێگای خەبات شەهید کران.. ناتوانم وەکو پەیمانم بەخۆیان دابوو خزمەتی کەس و کاریان بکەم بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە لە شاخ بووم .. زۆر کوێرەوەریم بەسەر هاتووە ..! گەلێك یادگاری تاڵ و شیرینم هەیە ئەگەر تەمەن مەودای دام ئێوەش ئاشنا دەکەم .

ژیانی پێشمەرگایەتی گەلێك سەخت و دژوارە، گەلێك هەورازو نشێوە گەلێك سەرکەوتن و ژێرکەوتنی تیایە، دووری کەس وکارو دۆست و ئازیزان، بێبەش لە هەموو خۆشییەکی ژیان، ساردی زستان و گەرمی هاوین، بێ نان و ئاوی، شەڕو لێکدان لەگەڵ دوژمن، بریندارو شەهیدان، زۆر زۆر لە هەموو ئەوانە ناخۆشتر کە بە هەموو کەسێك ناکرێ مەگەر هەر مەفرەزەی پارتیزانەکان خۆیان لەبەر بگرن .

پاش شەڕی قەندیل مەفرەزەکان هەموو بەسەر کوردستاندا دابەش بوون لە گوندی کانی سوسکەی بەستی شەرغە بووم لە ناوچە مەنتکایەتی ئێوارەی ڕۆژی ١/ ٦/ ١٩٧٧ دانیشتبووین

ئیمان دەزانی چارەنووسمان چی بەسەردێت لەپڕ هەندێ پ.م هاتن هەواڵی شەهید سەعدی گچکەو کاک سەید کاکەیان پێبوو پاش کەمێك ئەوانیش هاتن .. بۆ یەکەمجار لە ژیانی پێشمەرگایەتی هەڤاڵی تێکۆشەر، پاڵەوانی دەشتی هەولێر، قارەمانی داستانی دەشتیۆ کاك سەعدی گچکەم دی، هەڤاڵ قادر عەزیز لەگەڵ کاك سەید کاکەو دەستەیەك پێشمەرگەی لەگەڵ بوو منو کاك شاخەوان شاگەشکە بووین، کە شۆڕشەکەی خۆمان بەو شێوەیە بینی .. چەند ڕۆژێك لەگەڵ بەڕێز شەهید سەعدی بووین، زۆر ڕێزی گرتین ئێمە هێشتا لە هەرەتی لاوێتیدا بووین زۆر قسەی بۆ کردین لە بیرمە نامەیەکی هەڤاڵ شەهید عەلی عەسکەری بۆ هاتبوو، کە تیایدا نووسرابوو: ـ

- برای زێدە خۆشەویستم کاکە سەعدی ..
- برای زێدە خۆشەویستم کاکە سەید کاکە ..

سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

هەربژین بۆ گەلی کوردمان

ئێمە پاش شەڕی قەندیل چووین بۆ ناوچەی سلێمانی خۆشت دەزانی لە چیای هەوری تووشی شەڕ بووین چوار پ. م شەهید بوون . ئەوا بۆ مەفرەزەکان هەریەکە (٣٠) دینارم نارد هەر ئەوەندە پارەمان لەدەستدا بوو .
چاوی یەکە یەکەی پێشمەرگەکان ماچ دەکەم .

ئیمزا
برای دڵسۆزتان
عەلی عەسکەری

یعلی شەهید عەلی عەسکەری بۆ هەر مەفرەزەیەك، کە پێکهاتبوو لە (١٢) تا (١٥) پ.م تەنیا (٣٠) دیناری ناردبوو، چونکە ئێمە پارەمان نەبوو، ئێمە زۆر خۆشحاڵبووین کە سەرکردەکانمان هەرگیز شتیان لێنەشاردووینەتەوە .

لە ئەشکەوتێکی گوندی نێرەگێن کۆبونەوەیەکمان کرد کە ئەم هەڤاڵانە ئامادە بوون :-

١- شەهید سەعدی گچکە .

٢- شەهید عەلی ساڵح .

٣- کاك سەید کاکە .

٤- کاك قادر عەزیز .

٥- شەهید ڕێباز .

٦- شەهید شاخەوان .

٧- شەهید قادر مستەفا .

لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیارماندا، کە دوو لیژنە پێك بهێنین بۆ ئەوەی داوا لە جوتیارەکان بکەین یارمەتی شۆڕش بدەن، تاکو پێویستییەکانی پ.م جێبەجێ بکەین وەکو جل و بەرگ، فیشەك، کڕینی چەك، خەرجی خواردەمەنی پ.م .

## شەهید محەمەد عەجەم

شەهید محمد عەجەم ئەو تێکۆشەرە ناودارەی شاری قەڵاو منارەو شێخی چۆلییە، کە ئەو شارە بە شانازییەوە ناوی کاکە محمدو ساڵح نەفاسەو سەعدی گچکە دەنووسێتەوە لە مێژووی خۆی .

شەهیدی هەڤاڵ محمد عەجەم تاقانەی دایکو باوکە دەربەدەرەکەی بوو، کە لە کوردستانی ئێران پەراگەندەی کوردستانی خواروو بوون .

شەهید لە شۆڕشی ئەیلول لەبەر ئازایەتی ناوی دەرکردبوو، وەلە سەرەتایی دەست پێکردنەوەی شۆڕش لە ریزەکانی رێکخستنی کۆمەڵەو یەکێتی دەستی بەکارکردەوە .

شەهید لە ١١/ ٥/١٩٧٧ لەلایەن رژێم فەرمانی گرتنی دەرچوو، لە رۆژی ١٣/٥/١٩٧٧ خۆی گەیاندە ریزی مەفرەزە سەرەتاییەکان لە ناوچەی دەشتی هەولێر .

پێویست ناکات ئازایەتیو دلێری هەڤاڵی شەهید محمد عەجەم باس بکرێت ئەوەی واتای پێشمەرگایەتی بزانێ باش دەزانێ شەهید محمد چۆن بووە .

شەهید چەندین جار بە نهێنی بۆ راپەڕاندنی ئیشو کارەکانی رێکخستن گەڕایەوەتەوە هەولێر ، حەیف لە شەوی ٩-١٠/٤/١٩٧٨ لە کاتێکدا لەگەڵ هاوڕێ خالید سابیر دەیانویست لە هەولێر بگەڕێنەوە ناو مەفرەزەکان لە نزیک گۆڕستانی سەید مەعروف کەوتنە پیلانی دوژمنانو ناپاکی لێکراو بە دەست رێژێك ئەو دوو تێکۆشەرە شەهید کران .

## نامەی ناو زیندانی شەهید مەولود هەمزە

## لە دوا وتەی شەهید کردنیدا

باوکە گیان .. دایەگیان براکانم .. ئامۆزاکانم .. خۆشەویستەکانم تکام وایە ئەم چەند وتەیەم پەیڕەو بکەن‌و گوێم بۆ شل بکەن بالە جیاتی دەنگی ڕاستەقینەی خۆم بە وشە لەگەڵتان بدوێم .. بۆ یەکەم جار زۆر زۆر سوپاس‌و ڕێزم هەیە بۆ ئەو خزم‌و کەس‌و کارو دراوسێ‌و هاوڕێیانە، کە هاتن بۆ لام . جا بۆیە لە هەمووتان تکاو داواکارم کەوا هیچ کەسێك بۆمن خەفەتبار نەبێت‌و خەم نەخوا چونکە :

پێی ناوێ بۆ شەهیدانی وەتەن شێوەن‌و گرین

نامرن ئەوانەی وان لە دڵی میللەتا ئەژین

هەر بە هەمان شێوە زۆر ڕاستە ژیان خۆشترە بەڵام لە پێناوی نیشتماندا مردن گەلێك خۆشەویسترە . وە لەسەر ئەم شێوەیە هەگیز مەڵێن خۆی کوشت‌و ئێمەشی کوشت بەڵکو خوێنە ئاڵەکەی ئێمە نەوتە بۆ هەڵگیرساندنی مەشخەڵی بیری ڕاستی‌و ئازادی لە کوردستاندا:

توخوا بابە .. دایە .. براکانم .. ئامۆزاکانم : -

لەلایەن منەوە گەردنتان خۆش‌و ئازاد بێ‌و گەردنی هەموو خزمان‌و دراوسێکان‌و هاوڕێیان ئازاد بێت تکام وایە هەتا گەردنی ئەو کەسەش خۆش‌و ئازاد بێت کە بەگرتنی داوم‌و تووشی پەتی سێدارەشی کردم. وە گەردنی هەموو کەسێك خۆش بێت .

هیوام وایە، کە دایکە خۆشەویستەکەم بەهیچ شێوەیەك دڵی باوکم‌و منداڵەکان زویر نەکات‌و بە ژیانێکی کامەرانی بژین . هەروەها داواکارم لە کاك عەبدولکەریم کە گوێڕایەڵی باوکم‌و دایکم‌و مامم بێت بەقسەیان بکات‌و عاجزیان نەکات .

ئەگەر هات‌و براو ئامۆزاو کەس‌وکارم ڕێگەی خەباتیان گرت ئێوە ڕێگایان لێمەگرن . بە تایبەتی کاکە عەبدولکەریم‌و عومەرو فەرهادو دارا .

باوکە گیان .. مامە خۆشەویستەکەم .. من تەنها شەهیدی ئێوە نیم‌و هەر بەهی خۆتانم مەزانن بەڵکو بەهی گەل‌و نیشتمان‌و کوردستانم بزانن‌و موڵکی هەموو گەلین .

من لە ١١ی مایسی ١٩٧٧ گیراوم لە هەولێرو لە ٢٩ حوزەیرانی ١٩٧٧ لە شاری کەرکوکی کوردستان لە دادگا شێوە ڕەش بینەکەی (هیئە الخاصە) فەرمانی خنکاندنم لەسەر درا .

له ٢٠ ی تەموز ١٩٧٧ هاتم بۆ ژووری خنکاندن (ردهه الاعدام) له موسڵ ، له ڕۆژی شەوی ١١-١٢/٩/١٩٧٧ ئەمری خنکاندنەکەیان جێبەجێ کرد .

تکایه لەگەڵ سەرکەوتنی گەلو لەبن وێنەیەکی گەورەم ئەم چەند دێڕە شیعرەم بە خەتێکی جوان بۆ بنووسن :-

لەناو قوڵپو فرمێسکی دایکی شیرینم

مۆمی شادیم بۆ چەوساوەی نیشتمانم

خوێنم نەوتەو ئەیکەم بەدیاری ئەینێرم

بۆ ئاوەدانو کارکردنی کێڵگەو کارگەی کوردستانم

زۆر تکام وایە ئەو کەسەی، کە زۆر منی خۆش دەوێت لەجیاتی هەموو دیارییەك ، ماچ کردن بێت بە چاوە کڕەکانم، کە لەسەر پەتەکە زۆر گەشو جوان بووەو خۆشم زۆر جوان بووم .

بێ باک له مردن سێدارەی دوژمن

پەتی خنکاندن ئەکەیتە گەردن

کرێکارێکی هەژاری کوردم

هیچ پەشیمان نیم لەوەی کە کردم

ئیتر بەخواتان ئەسپێرمو خۆشیو بەختەوەریتان

بکەن بە ئامانجی ڕاستەقینەتان لە ژیان

بلوکە گیان .. مامەگیان .. دایەگیان .. مامۆژن .. براکانم .. خوشکەکانم .. ئامۆزاکانم ..

ئیتر خواتان لەگەڵو خواحافیز

ئەمە دوا نووسینی ژیانمە بۆ ئێوەم کرد بە دیاریو پێشکەشتان بێت .

بۆ ئاگاداری هەر کە ئەم نامەیەی دوا ژیانم نووسی دەستم بە کەلەبچەی دوژمن وەکو بازن بەسترابوو .

بچوکی شەهیدتان

مەولود هەمزە عومەر

ژووری خنکاندن نەینەوا

شەوی ٢١-٢٢/٩/١٩٧٧

کاتژمێر (٩) ی بەیانی

## شەهید مەولود هەمزە

شەهید مەولود هەمزە ، باوکی کرێکارێکی هەژاری ئاوباری هەولێرە، شەهید مەولود لە کۆتایی ساڵەکانی خوێندنیدا لە دار المعلمین ی هەولێر لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیرا .

شەهید تەمەنی هەژدە ساڵ بوو لێپرسراوی دووەمی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو لە هەولێر .

شەهید لاوێکی خوێن گەرمو چالاك بوو بەهەموو تەقەلای ئەو ڕێکخستنەکان لە شاری هەولێر گەشەیەکی بەرچاوی کرد . داخەکەم لەلایەن نۆکەرانی ڕژێم چاودێری دەکرا بێئەوەی خۆی هەستی پێ بکات .

شەهید لە ڕۆژی ١١/ ٥/١٩٧٧ دا کەوتە داوی دائیرەی ئەمنی هەولێرو دەستگیر کرا، لە ئەمنی هەولێرو هەیئە خاسە ئەشکەنجەو ئازاری زۆر چەشت دوا جار لەلایەن دادگای ناداد پەروەرانەی فاشستەکانی بەغدا فەرمانی لە سێدارەدانی دەرچوو ، پاشان لەگەڵ هەڤاڵەکانی تریدا لە سێدارە درا .



شەهید مەولود هەمزە

## شەهید جەمال عەلی باپیر

شەهید جەمال مفەوەزی پۆلیس بوو، لە سەرەتای شۆڕش بەشداری هەبوو لە ڕیزی پێشڕەوی حیزب و تێکۆشان، سەرەتا جێگری فەرماندەی هەرێمی ٤ جافایەتی بوو، ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، باوکی لە زیندانی ڕژێمدا شەهید بوو، خەڵکی شاری سلێمانی شاری هەڵمەت و قوربانییە ، لە ١٩٨١ لە گوندی سێ کانیانی جافایەتی لەگەڵ چواردە پێشمەرگەی تری کوردستان شەهید کران، کە برینێکی گەورەیان لە لاشەی کورد دروست کرد بە ئاستەنگ سارێژ دەبێت .

کاک جەمال چەندین جار لە ژیانی پێشمەرگایەتی بریندار بوو، بە شەهیدبوونی کوردستان بە جارێك هەژا، فرمێسك لەچاوی دۆست و ئازیزانی هاتە خوارێ دڵی دوژمن و ناحەزانی پێخۆش بوو .

کاک جەمال وەرزشکارێکی بەناوبانگ بوو بەردەوام ڕاهێنانی وەرزشی دەکرد .



## شەهید ئەحمەد قەمبەری

شەهید ئەحمەد ئۆمەر خەلکی گوندی قەمبەری سەر بە ناحیەی تەقتەقە بە منالّی لە گوندەکەی خۆیان شوان بووە ، باوکی جوتیارێکی هەژار بوو .

شەهید لە سالّی ١٩٧٦ دا پەیوەندی بە مەفرەزە سەرەتاییەکان کرد لە دەشتی هەولێر شەهید یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی، کە بە بەردەوامی نوێژی دەکردو ڕۆژوی دەگرت پیاوێکی موسلّمان بوو .

شەهید دژی ئەو کەسانە بوو، کە جوتیارەکانیان ئازار دەدا، بەڕاستی خۆشەویست بوو لەو ناوچانەی، کە پێشمەرگە بوو .

شەهید لە سالّی ١٩٧٩ کرا بە فەرماندەی مەفرەزە .

لە سالّی ١٩٨١ کرا بە فەرماندەی کەرتی ٢ لە هێزی دەشتی هەولێر . شەهید ئازاو نەترس بوو، بیروباوەڕی زۆر بوو بەچینە چەوساوەکانی کوردستان شەهید بەشداری چەندین شەڕو پێکدادانی لەگەلّ دوژمن کردووە ، تا لە ڕۆژی ٢٧/ ٤/١٩٨٣ لە شەڕێکی بەرگری لەبیروباوەڕو سەنگەری خۆی شەهید کرا . تەرمەکەی شەهید لە گوندی بالیسان بە خاك سپێردرا ، پاشان گوێزرایەوە شوێنی لە دایك بوونی .

شەهید ئەندامێکی دلّسۆزی کۆمەلّەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو .

## شەهید هاوڕێ کاوە

شەهید کوڕی مامۆستا (مەلا حوسێن)ە خەڵکی مەخمور (قەراج)ە .

شەهید لە ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی بە مەفرەزە سەرەتاییەکان کردو لە دەشتی هەولێر لەمانگی ٦/١٩٧٧ دا پەیوەندی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد

شەهید هاوڕێ کاوە یەکێك بوو لەو تێکۆشەرانەی، کە میللەتەکەمان شانازیان پێوە دەکات .

شەهید هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆریدا تاکو خۆی پەروەردە بکات هەمیشە لەو کەسانە نزیك دەکەوتەوە، کە پەرتووکیان دەخوێندەوە .

شەهید لە ساڵی ١٩٧٨ بوو بە فەرماندەی مەفرەزە لە ناوچەی سلێمانی .

شەهید لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠ لەبەر ئازایەتی کرا بە فەرماندەی کەرتی ١ ی دەشتی هەولێر لە هەرێمی ٨ .

شەهید لە چەندین شەڕو پێکدا هەڵچوون بەشداری کرد .

شەهید لە هاوینی ١٩٨٣ لە نزیك گوندی گردەسووری دەشتی هەولێر مار پێوەیدا زۆر بە ئاستەنگ گیانی ڕزگار بوو .

شەهید لەبەرئەوەی ئازاری زۆر بوو لەلایەن سەرکردایەتی داوای لێکرا، کە لە بالیسان بۆ ئەوەی برینەکەی چاك ببێتەوە پشوو بدات .

لە تشرینی دووەمی ١٩٨٣ لەلایەن ناحەزێکی کورد لەناو گوندی بالیسان تەقەی لێکراو شەهید بوو .

## شەهید سەرباز

شەهید خەلکی کۆیەیەو لە سالی ۱۹۷٦ لە دەستەی د. خالید پێشمەرگە بوو لە پاشان کرا بەفەرماندەی مەفرەزە، یەکێك لەو پێشمەرگانە بوو، کە ڕەچاوی ئەوەی لێدەکرا، کە ببێتە یەك لە سەرکردەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە بناری کۆسرەت و دەشتی کۆیەو خۆشناوەتی و بەری مەرگە ، ببوە جێگای متمانەی خەلك . پاش ئەوەی فەرماندەی کەرتی بری بە سەرکەوتوویی کرا بە جێگری فەرماندەی تیپی ۹۳ کۆیە . شەهید سەرباز ئازایانە زەبری لە دوژمن دەوەشاندو یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی، کە بە چاکی یاسای پارتیزانی جێبەجێ دەکرد، داخەکەم لەلایەن دەستەیەك چەکداری بەناو کورد، کە ئەوانیش بە گوتەی خۆیان هەر بۆ کوردیان هەولّ دەدا بۆسەیان دانابوو لە نیسانی ۱۹۸۳ لە گوندی باداوانی دۆلّی خەلکان لەگەلّ شەهید شەمالآو دوو پێشمەرگەی تر شەهید کران و خوێن گەشیان بوو بە ئاگرێك دەیان کوردی تریش سووتان .



شەهید سەرباز



ڕەنگە پێت وابێ مەفرەزە سەرەتاییەکان وەکو ئەوانەی کە بەزۆر ناویان لەخۆیان ناوە پێشمەرگەو ئێستا لەناو شارەکان بە سەیارەی جوانو کلاشنکۆفی بریقەدار دەسوڕێنەوە، مەفرەزە سەرەتاییەکان ڕەنگو هەڵسو کەوتیان گەلێك نامۆیە لەگەڵ ئەو جۆرانە، مەفرەزە سەرەتاییەکان لەگەڵ دڕندەترین هێزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەجەنگان، کە ئەویش سوپای عێراقی بوو، کە ئەو کات خۆی لە (٣٠٠) سێ سەد هەزار سەرباز دەدا جگە لەسەدان فڕۆکەو کۆپتەرو دەبابەو تۆپو چەندین هەزار خۆفرۆشی کاسەلێس مەفرەزە سەرەتاییەکان ڕۆژانە چەندین تێکۆشەریان لێ شەهید دەکرا، کەس و کاریان لەناو شارەکان دەگیران ، دوژمنی نەفس تەڕو خۆفرۆشەکانی ئەگینارد تاکو ببێتە پەم و لەوێ دەست لە تێکۆشەران بوەشێنیو لە پاشان خۆی تەسلیم بکاتەوە لە بری ئەمە بەهەزاران دیناری وەرگرت.

مەفرەزە پارتی زانەکان لە کاتژمێری سێی بەیانی ئاوەدانیان بەجێ دەهێشت تاکو ڕۆژ ئاودیوی کەل دەبوو نەدەگەڕاینەوە ناو ئاوەدانی بەیەك کاتژمێر دەبوایە نان بخۆینو کەلوپەلەکان هەڵگرینو کۆبینەوە .

له ناوەڕاستی بەهارو کۆتایی پایز واتە لە تێپەڕیدا نزیکەی (٨) مانگ لە چۆڵێکدا دەخەوتین بەڕاستی (ئەرز دۆشەك‌و بەرد سەرین) توخوا بە قسەی پان‌و بەرینی هەندێ هەڵ پەرست باوەڕ مەکە تەنیا پارتی زانەکان وابوون، کە لە پاشان خۆشی بەسەر دەستان داهات هەندێك شۆڕشیان وەکو (پیشانگەی ئێستاو قۆنتەرات چی پێشان ڕەچاو دەکرد) بەڵێ ئەو مەفرەزە سەرەتاییانە ئەئاوا ژیانیان بە ئاستەنگ بوو .. کە ئێواران دەچووینە ماڵە جووتیارێك ئەگەر پێشمەرگەشی خۆش نەویستایە، کە چاوی بە بارو دۆخی ئێمە دەکەوت بۆرو چلکن، سەروریش هاتوو، ڕەنگ زەردیی بێ خواردنی، هیلاك‌و شەکەت، لە زستان ئاو و چۆڕاوکەی دەبەست جێگای وشکمان ددان بوو، بەڕێزو بە بێدەنگی هەرچی هەبوایە دەمان خوارد، بەناچاری دڵیان بۆمان دەسووتا .

زۆر جووتیاری هەژارم دەدی بەگوڕ فرمێسکی بۆ ئێمە دەهاتە خوارێ .. دەی گوت ! باشە ..! هەر ئێوە کوردن ..؟ دەبێت هەر ئێوە بمرن ..؟ هەر ئێوە بەرەزاڵەت بژین ..! ئەی ئەو هەموو کوردە چییە ..؟

ئێمە هەرگیز دڵمان تەنگ نەدەکردن بەڕاشکاوی‌و لەسەرخۆ سیاسەتی ڕژێمی عێراقمان شی دەکردەوەو ورەشمان بەرز دەکردنەوە، کە ئەو ڕژێمە دڕندەیە دەبێ بڕوخێ، جووتیارەکان .. ئەو قسەیان بە مێشکدا نەدەچوو ..! دەیان وت بەخوا برام ئەو زاڵمە هەر وا بەهێز دەبێ .. خوا بتانپارێزێت .

بەڵێ، کە نانمان دەخوارد نانی دوو ژەمیشیان بۆ ئامادە دەکردین .. جووتیارانی کورد پێش دە پازدە ساڵ بارودۆخی ژیانیان زۆر خراپ بوو زۆر جار کەیبانوو دەیووت بەخوا برام لە نانی وشك زیاترمان نییە دەمان وت بەزیاد بێت دەچووینەوە مزگەوت‌و چاوەڕێی قسەکەی فەرماندەکەمان بووین .

کە بەشەو لە گوند بەڕێ دەکەوتین نەدەبوایە چرپەی پێڵاومان بێت، جگەرەو ئاگر بەکارهێنان‌و قسەکردن قەدەغە بوو، لەدوای یەکتری دەڕۆیشتین ئەوەی لەپێشەوە دەڕۆیشت شارەزا بوو دەبوایە ئاگاداری برادەرانی پشت خۆشی بێت .. دوا نەکەون .

لەپاش یەك سەعات ڕۆیشتن لە پەنایەك دادەنیشتین ئەگەر لە مۆلگەی دوژمن دوور بووینایەو دیار نەبووین ئینجا جگەرەمان دەکێشا، بارمان گران بوو هەموومان هەریەکە ٦ مەخزەنی کلاشینکۆف‌و چەك‌و نانی ژەمێك ئەگەر زستان بوایە قەمسەڵەو ئەگەر نۆرەی قۆری‌و شەکرۆچا بوایە ئەویشی هەڵدەگرت، ئەگەر لەناوچەیەکی دیدەوان‌و دەشتی بواین سەروداری وشکیشمان

هەڵدەگرت تاکو چای پێلێبنێین ئەگەر ئەو مەفرەزەیە ئاریبجی هەبوایە دەبوایە سەروگوللەی ئاریبجیش هەڵبگرین .

من نازانم چۆن ئەو هەموو شتەمان پێهەڵدەگیرا لێرەدا وا ئەم چەند دێڕە دەنووسمو دەڵێم : -

باشەمنیش ئەو هەموو شتەم هەڵ دەگرت ..! ئاگری کوردایەتیو زاڵمی بەعس وای لێکردبووین ماندوبوونمان نەدەزانی، کە ڕۆژ دادەهات دوو دوو دەچووینە سەنگەرێك، باشتر بڵێم شوێنێکی توندو تۆڵ ، هەمیشە خۆمان دەشاردەوە ..! شوانیش بە ڕۆژ تا عەسرنەئەبوایە بمان بینیێ ئەگینا بەیەك (زللەی زمان) دۆخمان خراپ دەبوو دوور نەبوو هەموومان شەهید ببین ..!

زۆر ڕۆژان هێزی حکومەت دەهات ٥ تا ٧ کۆپتەری لەگەڵ بوو گرمەیان دەهاتو تەقەیان دەکرد تا ئێمە وەلامیان بدەینەوە بزانن ئێمە لەکوێین .. زۆر ڕۆژ هەبوو نانی نیوەڕۆمان نەدەخوارد لەبەر کۆپتەر هەر دەسوڕانەوە بۆ ئەوەی بمان دۆزنەوە .

زۆر شەوان هێزی دوژمن دەوری گوندەکانی دەگرت ، ئێمە لەبەر جووتیارەکان، کەمینمان دانەئەگینا ، دەڕۆیشتین چەند جارێك دەورمان دەگیرا بە شەڕی مەردانە بەدەستو تفەنگی خۆمان ڕزگار بووین، شەڕی هەوری، سناوە، جەلی شەڕی گوندی سماقە، ناوچەی دەشتی هەولێر، شەڕی قاز بەگیان، سوێرە لە شێوەشان لەناوچەی دەشتی کۆیە گەواهی بۆ قسەکانمان زۆر شەو بە دزی دەچووینە ماڵی هەڤاڵەکانی خۆمان، قسەمان لەگەڵ دەکردن دەنگو باسی نوێمان دەگۆڕییەوە .

گۆشت خواردن نەبوو، مەگەر پێشمەرگەیەك لە کاتی دبەشکردن بە هەڵکەوت توشی ببوایە، خۆشتن بە دەگمەن بوو جلو بەرگمان زۆر کەم بەخاوێنی دەبوو بە تایبەتی لە زستانان .

کە بەڕێگادا دەڕۆیشتین لەشوێن پێی خۆمان دەترساین ، زۆرجاریش بەڕێگاکاندا نەدەڕۆیشتین .. چونکە دوژمن شوێن پێی هەڵدەگرتین .

هەموو ناوی خۆمان گۆڕی بوو بۆ ئەوەی دایكو باوكو براو خوشکمان نەگیرێ، بەلام جاسوسەکان پارە شێتی کردبوون، بەهۆی موختاری گەڕەکەکان دەیان دۆزینەوە، دایكو باوکی زۆربەمان دەستگیردەکرا ، ماڵی ئێمە لە عەمارە نۆ مانگ زیندانی کران . پارەمان هەر نەبوو، زۆر جار برادەرەکانمان، کە جووتیار بوون پارەی یەك دوو پاکەتیان دەدایێ بە دوو سێ مانگ جارێك هەریەکە (٥) دینارمان وەردەگرتو دەمان گوت یارمەتیمان وەرگرتووە هەرچی هەمان بوایە بەیەکەوە دەمان خوارد.

بەرچاومان تەنگ نەبوو، بیرمان لە سەرمایەی دوا ڕۆژ نەدەکردەوە، برایەتی نێوانمان گەلێ بەهێز بوو، درۆکردن لەگەڵ یەکتر وەکو خیانەت دەژمێردرا، بوختانو غەیبەت لەهیچ قوژبنێک جێگای نەدەبووە .

ئێمەی کۆمەڵە هەریەکە کیتابێکی ماوتسی تونگمان لابوو دەمان خوێندەوە.. بەگوێرەی ئەو کتێبە هەڵسوکەوتمان دەکرد، بەفروباران، گەرماوسەرما، هاوین زستان، پایزوبەهار بۆ ئێمە هەمووی ڕۆژی تەمەنەو دەڕوا .

بە راستی هەموومان کوردمان لەخۆشمان خۆشتر دەویست، بێ ڕێزی بە خەڵك، لێدان، جنێودان، خراپ دانیشتن لە ماڵان، هەرگیز نەدەبوو پێشمەرگەی پارتی زان بیکات . ترسنۆکیو خۆبواردن لە شەڕو تەمبەڵیو کارنەکردن پیشەی پارتی زانەکان نەبوو. کە برادەرێکمان بریندار یا نەخۆش بوایە هەموومان یارمەتیمان دەدا بە پەرۆشییەوە بووین . کێ لە هەموومان لەخۆبوردووتر بوایە . ئەو مەسئولی هەموومان بوو .. لە سەرەتا هەرگیز بە ئوتومبیل نەدەسوڕاینەوە ئەگەر مەترسی میریش نەبوایە، ئەگەر بمان ویستایە چێشتێك دروست بکەین هەر بەشەو لەماڵە دۆستێکی دڵسۆزو بەوەفای شۆڕش قاپو قاچاغمان دەبرد لە چۆڵەوانی دروستمان دەکرد ئەو ڕۆژە وەکو جەژنێکی کوردی لێدەهات .

زۆر لە پ. م کان ڕادیۆیان هەبوو هەمیشە ئێزگەی کوردی بەغدایان دەکردەوە ، لەگەڵ شەڕە ئێزگەکەی بەغدا، زۆربەیان گوێیان لەگۆرانی داواکراو دەگرت .

من زۆر حەزم لە بەرنامەی ڕۆژێ لە ڕۆژانەو دەرگاکانی ژیان دەکرد کە گۆرانیەکی بەسۆزم گوێ لێدەبوو هەموو ئەو برادەرانەم دەهاتە پێش چاو کە لە ڕۆژانی قوتابخانە یا هەر سەردەمێکی تر پێکەوە بووین . هەرگیز نەدەگریاین ئەگەر خۆشەویست ترین هاوڕێشمان شەهید بوایە .. چونکە دەمانزانی ئەوە چارەنووسی شۆڕشگێرانە، چەند تێپەڕی بەسەر شۆڕش تێپەڕیو دەوڵەمەندێکی کوردم نەدی یارمەتیمان بداتێ ، کەچی هەزاران کەس لەسەر خوێنی ئێمە، لەبەر ئەوەی ئێمە لەشاخ بووین پارەیان وەبەرکرابوو بەسەر شۆڕی دەژیان . زۆرجار بەسەر خۆمدا دەشکامەوە کە پیاوێك یا کچێکی مامۆستا پارەی دەردەهێنا بمداتێ.. دەمزانی دڵی بەمن دەسووتا بەڵام وەرم نەدەگرت ..! هەر چەندە زۆریش پێویستمان بوو، چونکە دەمگووت ڕەنگە ئەو دۆستە وا بزانی، کە زۆر محتاجین .

من بۆ خۆم لە ژیانی (١٥) ساڵ پێشمەرگایەتی ڕەنگە (٣ تا ٥) و شەرواڵو چۆغەم بە دروون دابێ، ئەگینا بە شانازییەوە هەر کۆنە بەرگی جووتیارانم بەکار دەهێنا. زۆر لەناو هۆبەو

پەخشالی کۆچەریەکان سووڕاینەوە، خەڵکێکی دڵپاکو نشتیمان پەروەرن، هەرگیز خەبەریان نێدەدەداین، پەنیر و لۆرکو ماستو ژاژیان دەداینێ ساڵی جارێك کاوڕێك یان جیسکێکیان بۆ سەردەبڕین .

هەموومان توانای ڕۆیشتنی زۆر چاکمان هەبوو کەسمان قەڵەو نەبوو، بەشاخ هەڵگەڕانو ڕێگا بڕین لەلامان ئاسان بوو وا ڕاهاتبووین، لە بارو دۆخی دونیا زۆرمان شارەزاییمان هەبوو.. بەهۆی ڕادیۆو خوێندنەوەی کتێبی هەمە جۆر، هەمیشە لەنێوان خۆمان ورتە ووڕتمان لێدەهات، سەرمان دەخستە سەریەك دۆخەکەمان هەڵ دەسەنگاند، ڕشکو ئەسپێ هەمیشە خەوی لێزڕاندبووین ، کە یەکترمان بزردەکرد بە دەرەنگ یەکمان دەگرتەوە بەهۆی جووتیارەکان دەنگو باسی یەکترمان وەردەگرت .

چەندین جووتیاری بە شەرەف، چەندین جووتیاری خاوەن ڕەوشتی بەرز بەهۆی میوان داری ئێمە.. دوژمن لە سێدارەی دان خۆ ئێمە ئەوەندەشمان نەتوانی یەك بستە زەویان بدەینێ ..!

شوانەکان زۆر وەفاداربوون، زۆر پێشمەرگەیان خۆش دەویست .. هەمیشە بەیەکەوە خەمی ەتیامان گۆڕ دەکرد ئەو هەر خەمی مەڕو پاوان گۆڕکێ بوو.. ئێمەش لەخەمی میللەتو کۆلکە بەعسییەکان بووین .

جاش ئەو وشە ناشرینەیە کە ڕەزای چەند زۆڵە کوردێکی گران کردبوو، چاو ساخی دوژمنان بوون، عەبا ڕەشی پێشەوەی سەربازەکان بوون بەجلو بەرگی کوردی ناویان لەخۆیان ئەگینا پێشمەرگە ، چاوبەستیان لە جووتیارەکان دەکردو دەیان خستنە داوەوە تا بە پێشمەرگە لە قەڵەمیان دەدان بۆ ئەوەی لە دوژمن پارەی چاك وەربگرنو ئافەرینیان بدرێتێ .

جاشەکان نەك هەر شەرەف و کەرامەتیان داماڵی بوو.. بەڵکو چەندین ساڵ خەباتی کوردیان دوا خست. ئەگەر یەکێك لە مەفرەزە سەرەتاییەکان تەسلیم بوایەتەوە.. دەبوایە ١٠ تا ٢٠ سەعات لەو شوێنە دوور بکەوتینایەتەوە، تاکو زانیاری ئەوان کارمان لێنەکات .

بە ڕۆژ جوڵانەوە زۆر خراپ بوو ڕێگای دوورو نزیك دەبوایە بەشەو ببڕین، موختارەکان، کە لەلایەن ئەمن دانرابوون.. سەرئێشەیەکی یەکجار زۆریان بۆ دروستکردین، لە گوندێك بۆ گوندێك، لەناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر، موختارەکان جیاوازیان هەبوو هەندێکیان باش بوون لە هەندێکی تر، بەڵام بەگشتی زۆربەیان پیاوی ڕژێم بوون.. بەیانی زوو بە هەڵەداوان دەچوونە (ئەمن) ، زانیاری تەواویان ئەدا. بەناچاری کەوتینە (ئیعدامی) شۆڕشگێرانەی چەندین موختار پاش ئەوە ساخ بۆوە، کە زەرەری گەورەیان بە شۆڕش گەیاندووە، ئەگەر بەشەو ڕوومان بکردایە

گوندێك دەبوایە زۆر بە وردی لە دەرەوەی گوندەکە هەست ڕابگرین.. لە پاشان چەند کەسێك لە پێشەوە بچێتە ماڵێکی ئەو پەڕی گوند پرسیار بکات.. نەوەکو بەم شەوە دوژمن خۆی لە کەمیندا داگرتبێ .

دووربین، کە باشترین پێویستیە بۆ پارتی زانەکان چونکە پاسەوانەکانمان لە شوێنی بڵند لەسەر سك ڕادەکشا بە دووربین سەیری ناوچەکەیان دەکرد.. هەموو جموجۆڵی ناوچەکەیان دەزانی.

سەرەڕای ئەوەی حزبی شیوعی لەگەڵ ڕژێم بوو لە ڕۆژنامەکان هەڕەشەی لێدەکردین، بە پیاوی ئیمپریالیزمی دەزانین بەچەند چەتەو ڕێگرێك ئێمەیان لەقەڵەم دەدا.. وەکو سەگەکەی لەیلان ناوی دەبردین، کە چۆن لە ئەنجامی لێدانیو دەهۆڵ لەلایەكو زۆرباش لەلایەك، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەندامانی حشع لە گوندەکان زۆر باش دەجووڵاینەوە، گلەیمان لێدەکردن کە ئەوە ڕەوشت بەرزی پێشمەرگەو ئاستی تێگەیشتنی دەگەیەنێت .

ئەگەر جووتیارەکان لەنێوان خۆیان ناکۆك بوانایە چەندی لە توانامان بوایە هەوڵمان دەدا کە چاکیان بکەینەوە، چونکە دووبەرەکیو نارێکی دانیشتوانی لادێکان لە ئەنجام بە زەرەری پارتی زانەکان تەواو دەبوو. نابێ ئەوەش بشارینەوە کە هەندێ مەفرەزەی خراپ، کە بەدەستی حکومەت هاتبوون یان هەر خۆیان مەرامیان وابوو بەتەواوی بە پێچەوانەی ئەوەی سەرەوە دەجووڵانەوە، سەرانەیان لە خەڵك وەردەگرت، زەکات، مەرانە، موختارانە، سەیارانە، تراکتۆرانە، مەکینانە.. هتد، زۆریان گیرفانیان، پڕکردوو تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە.

پیاوەکانی ڕژێم، کە بە فیتی ئەوان ببونە پ. م گیروگرفتی زۆریان بۆ دروست کردین، بە هەوڵو توانای خۆمان لەبەر دەستیان ڕزگار بووین.

لەگەڵ مامۆستای گوندەکان دۆستایەتی باشمان هەبوو، هەمیشە هەوڵمان دەدا، کە منداڵانی جووتیاران بچنە قوتابخانە لە نەهێشتنی نەخوێندەواریدا، جووتیارەکانمان هاندان، کە بەپیر بانگەوازی مامۆستاکان بچن. مەلای گوندەکان دەوری کاریگەریان هەبوو لەسەر خەڵك هەمیشە، کە دەچووینە گوندێك سەردانی مەلاکانمان دەکرد ، بە دەگمەن ئەگەر هەڵەیەك کرابێ لەلایەن مەلا بەڕێزەکان ئەگینا پیاوی تێگەیشتوو کورد پەروەر بوون.

شەهید مەلا محەمەدی نێرەگێو خوالێخۆشبوان مامۆستامەلا سمایلی بانی مارانو مامۆستای گوندی داربسەری گەورە.. دۆستی نزیکی ئێمە بوون لەو هەلو مەرجە دژوارەدا. ئەمانەو گەلێکی تریش ژیانو گوزەرانی مەفرەزە سەرەتاییەکان بوون، بەڵام هێشتا گەلێك

تەزگری ئەو تێکۆشەرانەی ئەو جوتیارە هەژارو نەدارانەی کە بە نانو ئاوی ئەوان لەسەر زەوی خۆیان بە پیشتوانی ئەوان، شۆڕشی گەلی کورد دەستی پێکرد، بە درێژایی خەباتی شۆڕش گیانیش کوڕەکانی ئەوان شەهید دەکران..! سەروەتو سامانیان بە تاڵان ڕۆیشت، وەکو زەمانی بە تەتقال کران.

دەبێ ڕۆژێکیش بێت خاوەن حەقەکان بە مافی خۆیان شادببنەوە بەرهەمی خۆیان بکەوێتە دەستی خۆیان، دەبێ تێکۆشەرانی گەل بە چاوی ڕێزو تەقدیرەوە سەیری جووتیارەکان بکەن ئەوان داوای پاداشتیان نەکردووە بەڵام پاداش دانەوەیان ئەرکێکی گرنگی نیشتمانیە، خۆلادان، دوورکردن لەو مەسەلەیە کەلێنێکی گرنگی شۆڕش فەرامۆش دەکرێ.

ئەو کەسانەی ئێستا خۆیان بەرپرسی جووتیارەکان دەزانن دەبێ ئەو ڕاستیە بیر خۆیان بهێننەوە، کە جووتیارەکان خاوەنی بنچینەی شۆڕشن. زوڵم کردن لێیان، فەرامۆش کردنیان، جۆرێکی کوشندە لە شۆڕشەکەمان دەداتو دەبێتە هۆی دڵ ساردبوونەوە.

دەبێ جووتیارەکانیش ئەو ڕاستیە بزانن، کە دۆخی ئاڵۆزی ئەمڕۆی کوردستان بۆ ماوەیەکی کورت هەندێ هەل پەرست سوود لەو دۆخە وەردەگرن هەندێ هەڵەی گەورە دەکەن خۆشیان دەڕژێن سەر سفرەی هەلپەرستان هەمیشە کورتە، شۆڕشگێڕان هەموو کەسێکی ناحەق دەشکێنن.

# قەرەداغ

## ئارامگای شەهید ئارام

هەروەکو لە پێشەوە باسم کرد لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ۱۹۷۷ دا چاوم بە شەهید عەلی سالح کەوت لەگەڵ کاک شاخەوان سێ قوڵی کۆبونەوەیەکمان کرد، کەوتینە باس‌و خواس لەسەر بارودۆخی کۆمەڵە لە ناوچەکە، بەڕاستی هەڤاڵنی بزووتنەوە باڵا دەست بوون، تەگەرەیان دەخستە ڕێگامان بواری ئیش کردنیان زۆر نەدەداین.

کاک عەلی سالح نەخوێندەوار بوو یەك وشەی نەدەزانی بنوسێ و بخوێنێتەوە زیاتر لە ۲۰ تا ۳۰ کاغەزی بۆ هاتبوو هەمووی هەلگرتبوو من‌و کاک شاخەوان‌و کاک عەلی چووین بۆ گوندی کانی سلێمانە هەموو کاغەزەکانمان خوێندەوە زۆرم لا گرنگ بوو کاک عەلی بە ڕەنگ یا بە دەست‌وخەتەکەدا دەیزانی ئەو نامانە کامە هی کامەیە، نامەکان هی شەهید ئارام، کاک سالار هی ڕێکخستنی شارو گەلێکی تری تیابوو، هەر بەو شەوە چووین بۆ گوندی خورخور لەماڵی شەهید قادر عەولا زۆر قسەو باسمان کرد.. ئەو کات شەهید قادر عەولا ئەندامی کۆمەڵە بوو کاسیی دەکرد.. بڕیارماندا، کە بچینە لای شەهید ئارام لەوێوە بەڕێ کەوتین بەرەو قەنبەر - سی گردگان - ئۆمەر گومبەت‌و پەڕینەوە بۆ تاڵەبان‌و لەوێش بەشەو جادەی تەق تەق‌و کۆیەمان بڕی‌و بەرەو خواربوینەوە بۆ کونەگورگ‌و پەلکانە ناسر ئاغا لەوێش بەرەو قورە بەرازەو پێباز شیوئاشان - قازی بەگیان - کانی کوردە - الا الله - کانی سوور - کلیسە.. دوو ڕۆژ پاشتر چوینە چەمی ڕێزان لە شێخان تووشی پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە بووین هەواڵی شەهید ئازاد هەورامیمان پرسی؟ هەواڵی‌لانەبوو، چوینە سوور قاوشان - زێڕینە - زەرزی.. لەوێ تووشی مەفرەزەیەکی پارتی بووین پێشمەرگەیەکی ئەوان زۆر مەردانە وتی: من لە جادەی سلێمانی - دوکان.. دەتان پەڕێنمەوە..! بەڵام خۆمان نەمان ویست، شەوێك لە چەمی ڕێزان ماینەوە شەوی دواتر چووینە کەلەباش‌و لەوێش چووینە کانی میران، لە کانی میران.. زۆر هەوڵماندا شارەزایەك بمان پەڕێنێتەوە گوندی سوسێ - ئالی مەرە - کەس لەگەڵمان نەهات..! لەپڕ ئافرەتێکی گەنج قیژاندی‌و وتی: من لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە دەچم‌و دەیان پەڕێنمەوە ئەوە چ خێرێکی خوایی بوو ئەو پێنج کوڕە لە هەولێر هاتوون شارەزانین) کە زانیان ئافرەتەکە بەڕاستی بوو..! چەند پیاوێك

هاتن ئێمەیان پەرإندەوە بەڵێ کورد ئافرەتی ئاوا تێکۆشەری هەیە، کە هەقە ناوی لە ڕێزی پێشەوە بنووسرێتەوە..! داخەکەم هەلو مەرجی ئەوکات ڕێگای نەدا ناوەکەی بزانم بەلاّم ئەگەر مابێ ئەوا یادی بەخێر بێت . لە گوندی سوسێی ئالی مەرە منو کاك عەلی سالحو کاك شاخەوانو شەهید نامقو کاك عەباس چووینە ماڵی مام حاجی ڕەشید زۆر ڕێزی گرتین زیاد لە پێویست..! بەو کات ژمێر یەکی شەوە خزمەتی کردین لەبیرمە نانو ماستێکی زۆر چاکی دەرخوارد داین زۆر لەگەڵ کاك شاخەوان یادی ئەو شەوە خۆشو ناخۆشە دەکەینەوە، هەر بەو شەوە ڕێگای بناری پیرەمەگرونمان بڕی و چووینە گوندی بیان لەوێشەوە بە نزیك گوندی قەرەچەتان لەگەڵ تاریك و ڕوون گەلی زێوەمان بڕی چووینە گوندی زێوە، پاش کەمێ پشودان بۆ یەکەمجار لە ژیانم ڕێگای سەختی پیرەمەگرون پێشوازی لێکردم، تاکو ڕۆژ ئاوا بوو ئەو چیا سەر بەرزەمان بڕی ئێوارەی ٩/٦ گەیشتینە گوندی قزلەر شەو ماینەوە بەیانی زوو گەیشتینە دۆڵی جافەتیو گوندی چۆغماغ لەوێش چوینە یاخ سەمەر لە ناو ڕەزوباخەکان چاومان بە پێشمەرگەی قسەخۆشو بەوەفا کاك دلێری سەید مەجید کەوت، کە لەگەڵ هاوڕێ جەبار بوو، بۆ ئێوارە گەڕاینەوە چۆخماخ لەوێ چاومان بە شەهید شەماڵ کەوت، وە مەفرەزەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان لەوێ بوو، شەو ماینەوە بڕیارماندا بەیانی زوو بەڕێ کەوین بۆ قەرەداخ لای شەهید ئارام چونکە لە جافایەتی نەبوو.. دووبارە بە چیای پیرەمەگرون هەڵگەڕاین لە بەیانی زوەوە تاکو عەسرێکی درەنگ هەورازو نشێوی ئەو چیایەمان بڕی هەر ئێوارە بەڕێ کەوتین شەو گەیشتینە گوندی قادراوە.. چووینە ماڵێك ئێمە نەمانەزانی کاك شەماڵ ناوی خۆی چییە..! ئافرەتەکە، کە چاوی بە کاك شەماڵ کەوت وتی: بە قوربانت بم ئەوە توشیم حەمەدی؟.. بەڵێ لەوێش ناوی ئەو تێکۆشەرەمان زانی هەر بەو شەوە چووینە گوندی باخ، کە گوندی شەهید شەماڵە لەوێ چاومان بەکەس‌وکاری شەماڵ کەوت زۆر ڕێزیان لێگرتین، بەقسە خۆشەکانیان ماندو بوونی ئەو چەند ڕۆژەمان لەبیر چوەوە، بە ڕۆژ لەناو باخچەیەك لە دووری گوند خۆمان شاردەوەو بۆ نیوەڕۆ لە باخ خواردنی چاکمان بۆ هاتو بۆ ئێوارە بەڕێ کەوتین لە کاتژمێر دووی شەو جادەی سلێمانی کەرکوکمان بڕی.. بەڕۆژ لەناو چەمەکەی بالأنجۆ ماینەوە.. زۆر شوێنێکی خراپ بوو بۆ پ. م، تاکو ئێوارە نەمان هێشت کەس بمان بینێ، کە ئێوارە داهات بەرەو گوندی دەربەندە سووتاو، کە چەند ماڵە مەڕدارێکی خێڵی جافایەتی لێبوو بەڕێ کەوتین شەوێ پاش نوێژی شێوان گەیشتینە گوندی دیلێژە، کە بەڕاستی گوندێکی دلگیرو خۆش بوو، شەو لەوێ ماینەوە بەیانی لەوێ بەڕێ کەوتین بۆ گوندی گوڕباز، بۆ ئێوارە لەگەڵ شەهیدی هەمیشە نەمر

تەندازیاری هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش کاك ئارام یەکترمان بینی، تاقمێك پێشمەرگە هاتن بەیەکەوە دانیشتن.. کاك دلێر یەکتری پێ ناساندین، کە ویستمان چاکوچۆنی لەگەڵ شەهید ئارام بکەین وتی: ئەوەش کاك عەریف بەکرە، من بە ڕواڵەتو شانو شەوکەت قۆزیو ڕێكو پێکی کاك عەلی ئامەخانم بە شەهید ئارام دانابوو..! چونکە لەناو کوردەواری هەمیشە لێپرسراوەکان، جلو بەرگو ڕۆیشتنو قسەو جار جار ڕێكو پیکیشیان جیاوازە لە پێشمەرگە..!

دەستمان کرد بە قسە.. هاتنە سەر باسو خواسی دەشتی هەولێر.. کاك ئارام قسەی دەکرد منیش بەبێ ئەوەی بزانم، ئەوە کاکە ئارامە.. وام دەزانی کاك عەریف بەکرەو بەسەری زمانم وەڵامم دەدایەوە، کاك دلێر وشیاری کردمەوە ئەوە کاك ئارامە..! بەم جۆرە زانیم کاك ئارام کێیە؟!

کورتە باڵا، لاواز، چاویلکە لەچاو، قسەی هێمنو لەسەر خۆ، بڕوا بەهێزی شۆڕش جلوبەرگ وەکو پێشمەرگەکان، دانیشتنو هەستانی لەوان جیاواز نەبوو، خواردنی لەگەڵ ئەوان دەخوارد.. ڕۆژانێ کە لەگەڵ شەهید ئارام بووین.. هەستم نەدەکرد، کە لە غەریبایەتیم! هەمیشە ئاگای لە ئێمە بوو لە کاتی نان خواردن، بە ڕێگا ڕۆیشتن لە خەرجی خۆمان بە سەری دەکردینەوە.. زوو زوو بەبرادەرانی سلێمانی دەگوت بزانن کەموکوڕیان چییە؟

بەڵێ نزکەی ٢٢ ڕۆژ ئێمە لەگەڵ شەهید ئارام لە ناوچەی قەرەداخ جەولەمان کرد، ڕۆژێك قسەیەکی وای نەکرد کە دڵگیربین، بەڵکو پێمان خۆش بوو هەمیشە لەگەڵی دابنیشینو قسەمان بۆ بکات شەهید ئارام چەندین کۆبونەوەی پێکردین لەسەر مەسەلەکان و ئارای سەرکردایەتی ڕوون کردەوە.. دیاربوو ماوەیەك لەوەپێش نامەیەکی بەڕێز مام جەلالی بۆ هاتبوو باسی هەڤاڵنی دەکرد.. لەبیرمە لە نامەکەی مام جەلال بۆ کاك ئارام ئەوەشی تیابوو، کە پرسمان بە سۆڤیەتیەکان کردووە لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش.. گەلێك گوند گەڕاین: خاوێ، گوڕپاز، کەس نەزان، کونە کۆتر، سیوسینان، سەرزل، تەنگی سەر، گەرەزیل، قەڵاسورو گەلێ شوێنی تر لەناوچەی قەرەداخ ئاشنا بووین لەگەڵ هەڤاڵان: عەلی ئامەخان شەهید ئاکۆ کاك ئاوات قارەمانیو کاك فاخرو مام ڕۆستەمو گەلێ هەڤاڵی تر.. دۆستایەتی بەتینمان دروستکرد هەر لەوێ چاومان بە هەڤاڵ مەلا بەختیار کەوت لەبیرمە لە سلێمانی هاتبۆوە پاقلاوەی لەگەڵ خۆی هێنابوو لەو گەڕانو هاتو چۆیەدا لە ناوچەی قەرەداخ شارەزایم لەسەر بارودۆخی ناوچەکە پەیدا کرد لە بناوانی باری ئابووریو کۆمەڵایەتی جووتیارانی قەرەداخ گەیشتم، شەهید ئارام سکرتێری گشتی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان بوو.. بیر تیژو ڕووناك بیرێکی گەورە

بوو، پێشمەرگەیەکی فیداکارو فەرماندەیەکی لێوەشاوەی شۆڕشی نوێی کوردستان بوو بڕوای وابوو دەبێ کۆمەڵە بە گوێرەی سەنگی خۆی هەنگاو بنێ چاک باری کۆمەڵایەتیو ئابووری، خێلایەتگەری ناو کوردستانی هەڵسەنگاندبوو، بڕوای وابوو هەتا ماوەیەکی دوور هێزە سیاسیەکانی تری کوردستان دەتوانن، دەوری خۆیان ببینن، زۆر دوژمنی ئەو کەسانە بوو، کە جمودی عەقائیدیان هەبوو، هەمیشە لەگەڵ ئەو کادرانە خۆی خەریک دەکرد، کە باش خوێندنەوەی بارودۆخی کوردستانیان نەکردبوو.

لەناو جووتیارەکانی ناوچەکە گەلێك خۆشەویست بوو، بە تەواوی پرانسیپەکانی شەڕی پارتی زانی جێبەجێ دەکرد پێی وابوو تاکە شێوەی خەبات، کە دوژمنی پێ دەشکێنن.. خەباتی چەکدارییە چونکە دوژمنی مل هوڕ گوێ بە هیچ قسەیەك نادات، خۆی سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی ناوەوەی دەکرد هەمیشە لە پەیوەندی توندو تۆڵ بوو لەگەڵیان. بەش بە حاڵی خۆم ناتوانم باسی خەباتو تێکۆشانی شەهید ئارام بکەم!، چونکە پایە بەرزی ئەو تێکۆشەرە لەلای منەوە هەموو شتێکە، شانازی دەکەم، کە یەکێکم لەو پێشمەرگانەی، کە توانیم لە هەلو مەرجی ئاوا دژواردا بە خزمەت شەهید ئارام بگەم.. ئەو چەند ڕۆژە لەگەڵ ئەو بووم هەرگیز لەبیری ناکەم، خۆم بە خوێندکارێکی ئەو خوێندنگەیە دەزانم، کە مامۆستای پایە بەرز ئارام سەرپەرشتی دەکرد.

لە ١/ ٧/ ١٩٧٧دا بۆ دوا جار دەستمان خستە ناو دەستی پیرۆزی ئەو قارەمانەو ئێمە بەرەو دەشتی هەولێر گەڕاینەوە پاش ئەوەی کۆلێك زانیاری پێ بەخشین، ئەویش بەردەوام لە هەڵسوڕاندنی کارەکانیدا بوو تا لە ڕۆژی ٣١/ ١/ ١٩٧٨ بە یەکجاری ماڵ ئاوایی لە هەموومان کردو لە گوندی تەنگی سەر لە ناوچەی قەرەداغ بەدەستی خائینانو خۆفرۆشان دڵی گەورەی لەلێدان کەوت.

بە شەهیدبوونی هاوڕێ ئارام زەبرێکی کوشندەی تر بە شۆڕشی کوردو (ی. ن. ك) بە گشتیو کۆمەڵە بە تایبەتی کەوت، مامۆستای نەمرمان ئارام وای فێر کردبووین، کە دەبێ کادرو پ. م کان گوێ بەوە نەدەن ئەگەر هەموو سەرکردەکانیان شەهید بن.. درێژە بە ڕێگای ئەوان بدەنو خەبات بەرەو پێش ببەن هەزار سڵاو لە گیانت ئەی مامۆستای تێکۆشەرانی ڕۆژانی ڕەشی کورد، ئەی ئەندازیاری  پ. م پارتی زانەکان.

لە قەرەداغ لەگەڵ کاك عەلی ساڵحو کاك فاروقو کاك نامق دابڕاین منو کاك شاخەوان گەڕاینەوە دەشتی هەولێر کاك عەلی ساڵحو برادەرانیش لەلای شەهید ئارام مانەوە.

تا گوندی باخ هەڤاڵیّ مام ڕۆستەمو شەهید شەماڵو شەهید عەلی ئامە خان لەگەڵمان هاتن ئەویّ لەلایەن کاك شێخ حەمەد ئەمینو خزمەکانی زۆر ڕێزمان لیّگیرا چەند بڵێی خزمەتیان کردین، هەموو پێویستیەکانی ڕێگایان بۆ جێبەجیّ کردین شارەزایان لەگەڵ ناردین بەو شەوە من و کاك شاخەوان، کە هەر یەکە شەهید ئارام کلاشنکۆفێکی بە دیاری پێدابووین بەرەو گوندەکانی تەرە مار بەریّ کەوتین لەگەڵ زەردەپەڕی ڕۆژ گەیشتینە گوندی عەوالاّن لەوێش بەڕیّ کەوتین ئێوارە گەیشتینە کلێسەی دەشتی کۆیە، پاش چەند ڕۆژێکی تر هاتینەوە دەشتی هەولێر.

زۆر دڵتەنگو بێزار بووین، بە بیستنی هەواڵی تسلیم بوونەوەی مەفرەزەی کانەبی چاوشین کۆیتەر بە ناوچەکەی وەرکردبوو کەس بەکەسەوە نەبوو هەر ئەو تاقمە شەوی ٤، ٥/٧/١٩٧٧ لە نزیك گوندی بەردبەر کەمینیان بۆ منو کاك شاخەوان دانـاوە.. بە نارەحەت ڕزگارمـان بـوو ماوەیەکی زۆر لێك دابڕاین تـاکو ٤/ ٨/ ١٩٧٧ لـە گونـدی تیمـارۆکی دەشـتی کۆیـە لەگەڵ شەهید عەلی سالح یەکترمان گرتەوە هەواڵی شەهید ئارامو برادەرانی لابوو وەپێی ڕاگەیاندم، کە برادەران بەریّ کەوتوون بەرەو سەرەوە بۆ هێنانی چەك.

ناوچەی دەشتی کۆیە بۆنی خـوێنی لیّـدەهات کۆیتـەرو هێزەکـانی ڕژێم ڕۆژانـە لـە ناوچـەکە دەسوڕانەوە، قالە فەرەج لـە ڕۆژی ٢٣/ ٧/ ١٩٧٧ لـە نزیـك گونـدی کـانی بـی کـاك حەمـە غەفورو هەشت پێشمەرگەی تری شەهید کردبوو نائـارامی بەتـەواوی ناوچـەکانی داگرتبـوو بـە ناچاری خۆمان لە پێشمەرگاکانیش دەشاردەوە ئەگەر باش شـارەزاییمان لەسـەریان نەبوایـە، لـە پاش چەند ڕۆژێك پەڕینەوە بۆ دەشتی هەولێر لە گوندی قەنبەر چاومان بە شەهید قادر مستەفا کەوت، لەگەڵ برادەرانی مەفرەزەی خۆشمـان کـاك شـاخەوان و شـەهید محەمـەد عەجـەمو شـەهید نەبەز یەکترمان گرتەوە.

لە مانگی تەموزو ئاب ڕژێم هەوڵێکی زۆریـدا تـاکو مـەفرەزەکان لـە دەشـتەکانی کـەرکوکو گەرمیانو هەولێرو کۆیە لەناو بەریّ.. زۆر چڵکاوخۆری نـاردە ناو ڕیزەکانمان بـە ڕاسـتی ئـەو دوو مانگە مەترسی زۆرمان لە دڵ پەیدا بوو سەرەڕای ئەوەش دوژمن بە کۆیتەرو مەفرەزەی بچـوکی جاشەکان هەمیشە ڕاوە پێشـمەرگەی دەکـرد، بەداخـەوە چـەندین تێکۆشـەر بـەر پیلانـی دوژمـن کەوتنو شـەهید بـوون ، چـەندین پ. م ی ئـازاو چـاو نەترسـیش لـە شـەڕی نابەرانبـەر گیانیـان بەختکرد، شۆڕش هەر سەرکەوتن نییە بەڵکو ژێرکەوتنو سەرکەوتنە، هەورازو نشـێوە ئەزیـەتو ئازارە، ئامانجی بەدی هێنانی مـەسەلەیەکی گەلێك گەورەیە، بیروباوەڕە مردنو ژیانە بەلاّم دەبیّ ئەو ڕاستییە بزانین ئەنجامی هەر سەرکەوتنە، ئەگەر دوژمن بە شەهیدکردنی خـەڵكو پێشـمەرگە

بیەوێت ئاگری شۆڕش خامۆش بکات، بە پێچەوانەوە ئەو خوێنە هەمیشە ئاگری شۆڕشی خۆشتر دەکرد، شۆڕشی کورد جیاوازیەکی گەورەی هەبوو لەگەڵ شۆڕشەکانی تری دنیا، چونکە دوژمنی گەورەی کورد دەیویست کورد لە ڕەگ‌و ڕیشەوە دەربهێنێ.. هەر بۆیە ئەگەر ڕۆژی سەد پ. م شەهید بکرایە، هیچ ڕێگای ترمان لەپێش نەمابوو.. یا کورد نەمان، یا شۆڕش بەردەوام بوون..! لە درێژەی باسی مێژووی شۆڕش دەردەکەوێت، کە مانگ هەبووە دوژمن (١٠٠) پ. م ی شەهید کردووە کەچی شۆڕش هەر کۆڕی خەباتی گەرمتر دەکرد، بێ گومان هەموو شۆڕشێك بە چەند قۆناغێك تێدەپەڕێ بەڕای من تاکو ئەو کاتە شۆڕش توانی ناسك ترین‌و سامناك ترین قۆناغ ببڕێ وە دوژمن نەیتوانی (لە بێشکەدا شۆڕش بکوژێ).

## شەهید شەماڵ

شەهید شەماڵ لە خانەوادەیەکی شێخەکانی گوندی باغ ی ناوچەی قەرەداغی سلێمانیە، لە ساڵی ١٩٧٧ لە مانگی حوزەیران لەگەڵ ئەو تێکۆشەرە لە گوندی چوخماغ لە دۆڵی جافایەتی ئاشنایەتیم پەیدا کرد بەجلو بەرگی پێشمەرگایەتی.

کوڕێکی ڕۆشنبیر و زانا بوو، لە هەرێمی قەرەداغ بوو بە فەرماندەی کەرت لە ساڵی ١٩٨١ بوو بە فەرماندەی تیپی ٩٣ ی کۆیە بەناوبانگترین شەڕی کە فەرماندەیی کردوە شەڕی کانی وەتمان بوو. بەهەمان کارەساتی شەهید سەرباز شەهید کرا. لە ساڵی ١٩٧٩ برایەکی تری لە گوندی بوگدی دەشتی کۆیە بەدیل گیراو لە پاشان لە سێدارە درا.



شەهید شەماڵ

# مام جەلال

## دەگەڕێتەوە خاکی نیشتمان

ماوەیەك گەڕانەوەو نەگەڕانەوەی مام جەلال قسەی سەر زاری برادەران بوو، شۆڕشی کوردستان کە سەر لەنوێ هەڵگیرسا دۆخی ناوەوەی لەبار بوو چەند بڵێی دوژمن وەحشو دڕندە بوو، هەڕەشەی لە کورد دەکرد، کە ڕەگو ڕیشەی هەڵ تەکێنێ ، زوڵمو بێڕێزی بەعس هەموو چینو توێژێکی گرتبوەوە ، کۆمەڵە، لە کوردستان بەنهێنی کاری شۆڕشگێرانەی دەکرد (قیادەی موئەهەرگیز) لە دەرەوەی وڵات دامەزرایەوە.

بێزاری خەڵك لە ڕژێم لەوپەڕی دابوو. بارودۆخی کورد لەبار نەبوو بۆ شۆڕش کردن، عێراق پەیوەندی لەگەڵ دنیای دەرەوە چەند بڵێی بەهێز بوو بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵەتە سۆسیالیستەکان ، بەرە بەرە لەگەڵ فەرەنساو ئەڵمانیاو چین پەیوەندی خۆی باش دەکرد، چەكو تەقەمەنیو کەرەستەی جەنگی چاکی پەیدا کردبوو، نرخی نەوت زۆر لە برەودا بوو، دەوڵەتانی عەرەب ئەو کات گرنگییان پێدەدرا .. لەگەڵ سوریاو لیبیاو جەزائیرو ڕێکخراوی فەلەستین بەرەیەکیان دروست کردبوو، لەگەڵ ئێرانو تورکیا هەمیشە سەردانی یەکتریان دەکرد. کەس بەقسەی ئێمە بڕوا نەدەکرد حکومەتی عێراق دڕندەو چەوسێنەرە.

لەبیرمە، کە کۆبوونەوەمان بە جەماوەر دەکرد لە گوندەکان.. هەمیشە ئەو پرسیارەمان لێدەکرا.. ئێمە کام دەوڵەتمان لەپشتە؟ چونکە ئێمە میللەتی خۆمان وافێر کردبوو، کە دەبێ دەوڵەتێك لە پشتمان بێت ئەوجا شۆڕش بکەین، ئێمە بەناچاری ناوی (یەمەنی دیموکراتی، فێتنام، لاوس، کەمبۆدیا)مان دەهێنا، هەروەها خەڵك زۆر پرسیاری بەڕێز مام جەلالی لێدەکردین.. هەردەمان وت ئەمڕۆو سبەی دەگاتە کوردستان.

بۆیە گەڕانەوەی مام جەلال زۆر پێویست بوو جگە لەوەی کارێکی مەعنەوی گرنگی هەبوو بۆ یەك خستنی ڕیزەکانی ی. ن. ك و کوردایەتی چونکە پەیوەندی لەنێوان خۆمان گەیشتبووە ڕادەیەك بە ئەرك بەرگە دەگرا، ڕەنگە هەندێ کەس لەو بارودۆخەدا وای ڕاگەیاندبێ کە گوایە ئەگەر مام جەلالیش نەگەڕێتەوە .. ئەوە سەرکردایەتی شۆڕش هەیە.. من ئەو کاتیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبووم.. چونکە کرداری ڕۆژانەی تێپەڕی زیاتر.. لە خەباتی چەکداری بێ (مام

جەلال)ی بەزەقی، پێوەدیاربوو لە دواییش ئەو بۆچونە چووە خوارەوەو.. ئێستاش هەر خۆی ناگرێتەوە پێم وایە دەکەوێتە دۆڵێکی زۆر قووڵ.

زۆر بێ پارە بووین، جل‌و بەرگ‌و پێڵاوی زستانی داهاتووی پێ بەرێ نەدەکرا، فیشەک بەشی یەک شەری نەدەکرد، چەندین پێشمەرگەی تازەمان بۆ هاتبوو چەکیان نەبوو، خێزانی پێشمەرگەکان، کە لە ترسی رژێم لە گوندەکان خۆیان شاردبۆوە کەوتبوونە سەر ساجی عەلی، پێویستیەکانی رۆژانە وای لە ئێمە کرد، کە لەسەرەتای مانگی ٩ ی ١٩٧٧ بچینە گوندی تاڵەبانی گەورە لە نزیک تەق تەق .. لەوێ داوامان لە جووتیارەکان کرد، کە یارمەتیمان بدەن، بەڕاستی درێغیان نەکرد .. چی لە توانادا هەبوو پێشکەشیان کرد، لەبیرمە لە گوندی داریەسەر سەرو پێنج دینارمان وەرگرت.. دوو حەیوانمان کڕی.. ئەو کات حەیوان زۆر هەرزان بوو، ڕەنگە بەهەردووکیان (٣٠) دیناری تێ نەدەچوو.

لە ئەشکەوتەکەی خوار ماڵەکانی داریەسەری گەورە بووین.. بیرمان دەکردەوە بۆ ئێوارە بەرەو کام لا برۆین..؟ لە ناکاو دەنگی یەک تەقە هات.. ! هەموومان لە شوێنی خۆمان ڕاپەڕین‌و دەستمان دایە چەکەکانمان..! وامانزانی دوژمنە کە سەیرمان کرد دوو چەکدار لە گوندەکە بەرەو لای ئێمە دەهاتن.. بە دووربین سەیرمان دەکردن، کە نزیک بوونەوە لێمان زانیمان کە شەهید نامقە، کە گەیشتنە لامان پاش یەکتر ماچ کردن یەکسەر وتی: لەلای مام جەلال‌و برادەرانی تر بووین ، کاک سەید کەریم‌و برادەرانیشی لە دۆڵی سماقوڵێن ئەوەش چەکی تازەیە، کە بۆمان هاتووە .. چەکێکی یەک لاقی کلاشینکۆفی پێبوو.

شەهید نامق خەڵکی تەق تەق بوو ئەندامێکی بەوەفای کۆمەڵە بوو، پێشمەرگەیەکی چاو نەترس‌و زیرەک بوو، ئێمە دوو پێشمەرگەی کۆمەڵە لەگەڵ ئەو برادەرانە بووین کاک نامقم جیا کردەوە .. زۆر پرسیارم لێکرد.. زۆر جار دەموت خۆت مام جەلالت بینی..؟ ئەو هەر دەی وت: بەڵێ.. لەوێ بووم، کە ناوی هەموو برادەرانی دەهێنا.. بەم جۆرە هەواڵی گەڕانەوەی مام جەلالم پێگەیشت.

دیارە لە مانگی ٧ ی ١٩٧٧ مام جەلال‌و هەڤاڵەکانی هەریەکە بەڕێگایەک گەڕابوونەوە ناو خاکی کوردستانی خوارو، لەبەر ئەوەی بارو دۆخی شۆڕش ناخۆش‌و پڕ گیروگرفت بوو، پەیوەندی نێوان مەفرەزەکان‌و کەرت‌و هەرێم‌و سەرکردایەتی زۆر بەئەرک بوو، هاتنی نامەیەک کاتێکی زۆری دەویست.

دەشتی هەولێر لەناوچەی سیّ سنوور زۆر دوورە.. بەپیادە ١٥ ڕۆژی دەوێت ، خەڵکی ناوچەی بەرادۆست و سیّ سنوور لەبەر نەبوونی ڕێگاوبان، نەبوونی ئوتۆمبیل، زۆر هاتوچۆی شارەکانیان نەدەکرد ، دۆست و برادەرایەتیان لەگەڵ ناوچەکەی ئێمە کەم هەبوو.. پەڕینەوەش لە جادەی گشتی حاجی ئۆمەران زۆر سەخت بوو بەهۆی تەنینی ڕەبایەی زۆر لەسەر جادە گشتی یەکە (کە سێیەم ڕێگا دەرەوەیە) دەنگ و باسیش زۆر بڵاو نەدەکرایەوە، تا سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.. کۆبونەوەکانی خۆی دوور لە هێرش و پەلاماری دوژمن ئەنجام بدات. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی ڕۆیشتبوون (ناوچەکەی ئێمە ئەو کات هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتی لێنەبوو).

کاک ئارام هەر لە قەرەداغ بوو، گوایە کاک ئارام لەبەر خراپی باری تەندروستی نەڕۆیشتبووەوە، هەر نەڕۆیشتنیشی بووە هۆی شەهید بوونی..! چونکە ئەگەر لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی بەشداری بکردایە.. لەوانە بوو هەر لەوێ دەمایەوەو چارەسەریشی دەکرا، نەچوونی شەهید ئارام بە بۆچوونی من هەڵەیەکی گەورە بوو هەر ئەو کەم تەرخەمیەش بوو.. دوژمن توانی لە ناوچەیەکی وا پێدەشت لە گوندی (تەنگی سەر) لە ٣١/ ١/ ١٩٧٨ دا شەهیدی بکات.

لە دۆڵی گوستە، کە هەموو برادەران بە دۆڵە (فشە) ناویان دەبرد کۆبونەوەی یەکەمی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەسترا، چەند جارێك هاوڕێیانی کۆمەڵە لەگەڵ هەڤاڵنی بزووتنەوە .. لەبیروڕاکانیان نەگەیشتنە یەکتر، مەترسی جیابوونەوەی لێدەکرا ! بەهۆی چەند تێکۆشەرێك لە پێشەوەی هەموومان شەهید حوسێن بابە شێخ ناکۆکیەکان سەلرددەکرانەوە، کۆمەڵە بڕوای بە زۆری و بۆری نەبوو داوای پاکسازی ڕیزەکانی شۆڕشی دەکرد لە دزو جەردەو پیاو کوژو گومان لێکراوان، هەڤاڵنی بزووتنەوە هەموو کەسێکیان کۆدەکردەوە. کە ئەوە لە یاسای شۆڕش بەدەرە هەر بەو هێزە زۆرو بۆرە دەیانویست باڵادەست پەیدا بکەن لەناو شۆڕش، لەسەر هەندێ کێشەی ناوچەیی کوردستانی ڕێك نەدەکەوتن و نەدەکرا.

بەڕێز مام جەلال هەمیشە پشتگیری بیروڕا باشەکانی کۆمەڵەی دەکرد بەهەرحاڵێ بەرژەوەندی بەرزی کورد لەوەدا بوو کەهەموو لایەك.. پێ لە هەندێ شتی خۆی ببەخشێنی، لە کۆبوونەوەکەدا ئەم هەڤاڵنە بوون بە ئەندامی سەرکردایەتی:-

لە کۆمەڵە: (شەهید ئارام، کاک سالار، کاک مەلا بەختیار، کاک نەوشیروان مستەفا، کاک مولازم عومەر، کاک تاڵب ڕۆستەم).

لە بزووتنەوە: (شەهید عەلی عسکەری، شەهید د. خالید سەعید، شەهید تاهیرعەلی والی، شەهید سەعدی گچکە، کاک عومەر مستەفا (عومەر دەبابە) کاک رەسولْ مامەند.

لە دەستەی دامەزرێنەری (ی. ن. ك):

کاك د. فوئاد مەعسووم ، کاك د. کەمال فوئاد ، کاك د. کەمال خۆشناو، کاك عادل موراد ، کاك عەبدولرەزاق فەیلی، سکرتێری گشتی: بەرێز مام جەلال ،کاك حوسێن بابە شێخ یەزیدی وەکو بێلایەن کرابە ئەندامی سەرکردایەتی د. خدر مەعسوم ئەویش وەکو بێلایەن.

## مەکتەبی سیاسی

بەرێز مام جەلال سکرتێری گشتی ی. ن. ك.

بەرێز شەهید ئارام ئەندامی مەکتەبی سیاسی لێپرسراوی بەشی رێکخستن.

بەرێز کاك سالار ئەندامی م ـ س لێپرسراوی ئیدارەو مالی.

بەرێز شەهید عەلی عسکەری ئەندامی م. س لێپرسراوی هـ . پ. ك.

بەرێز رەسولْ مامەند ئەندامی م ـ س لێپرسراوی بەشی رۆشنبیری.

بەرێز کاك نەوشیروان بوو بە فەرماندەی هەرێمی (٤) جافایەتی.

هەڤالْ مولازم عومەر فەرماندەی هەرێمی (٥).

هەڤالْ تالْب رۆستەم ف ـ هـ ـ (٦).

هەڤالْ مەلا بەختیار ل ـ س کەرکوك.

هەڤالْ تایەری عەلی والی ف ـ هـ (٢)ی شلێر.

هەڤالْ سەعدی گچکە ف ـ هـ (٨) دەشتی هەولێر.

هەڤالْ د. خالید سەعید هەرێمی گەرۆك.

کاك سەید کاکە بووە ف ـ هـ خۆشناوەتی.

سەرکردایەتی ی. ن. ك لە شوێنێکی وا توندوتۆلْو ستراتیژیو لەسەر سنووری سێ دەولْەت بوو بۆیە بووە مایەی نیگەرانی دوژمنانی کوردو ناحەزانی.

ئەگەر پیلان گێرانی دەولْەتانی دژ بە کوردی لەسەر نەبوایە بە ماوەیەکی کەم هەموو ئەو چەكو کەرەستانەی کە دۆستانی کورد لە دەرەوەی ولاّت بە کوردیان دابوو.. دەگەیشتە کوردستان دەتوانرا بەرلە دوژمن بگیرێو رێگا نەدرێ وا بەئاسانی گوندەکانی سەر سنوور چۆلْ بکا، لەو سێ سنوورە سەرکردایەتی تووشی چەند گیروگرفتی لابەلا بوو، کە جێگای داخە هەر

خوی مولازم حسەن خۆشناو شەهید کراو بووە هۆی ناکۆکیەکی توندوتیژ، وەکو هەموومان خۆمان هیچ یەکێك لەو شەڕانە لە بەرژەوەندی گەلەکەمان نەبوو.

پاش ئەوەی لەوێ کۆبوونەوەکان کۆتایی پێهات هەڤاڵان گەڕانەوە بۆ شوێنی ئیشکردنی خۆیان لەسەروبەری ساڵی ١٩٧٨دا سەرکردایەتی ی. ن. ك هاتەوە ناوچەی قەڵادزە لە زەڵێ و حوی ناوزەنگ و نۆکان بارەگای خۆی دامەزراند.

هاتنەوەی هەڤاڵان و مام جەلال بۆ وڵات و هێنانی سەدان پارچە چەك کارێکی باشی کردە سەر تر پێشچوونی شۆڕش، ئومێدو ئاواتی خەڵك زۆرتر بوو بە شۆڕش، سەدان تێکۆشەری تر پەیوەندیان بە شۆڕش کردو هاتنە ڕیزی هـ. پ. ك، کە هەواڵی هاتنەوەی مام جەلالمان بیست یەکسەر چووین بۆ دۆڵی خۆشناوەتی لەوێ چاومان بە هەڤاڵان سەید کاکەو سەید کەریم کەوت.

ئیجا پاش چەند ڕۆژێك گەڕاینەوە ناوچەکەی خۆمان وەڵامی پرسیاری جووتیارەکانمان لابوو، کە پێشتر خۆمان لێ بێ ئاگا دەکرد یان بە پێچ و پەناوە وەڵاممان دەدانەوە، جووتیارەکان ئەو پرسیارانەیان لێدەکردین:-

سەرۆکتان هەیە (بەواتای چ سەرکردەیەك لێپرسراوتانە..؟ چ دەوڵەتێك لەگەڵ تومیە.؟موچەتان هەیە..؟ چەك و کەرەستەتان لەکوێوە بۆ دێ..؟ ئەوجا وەڵام زۆر بوو لەلامان.

لە ٧/ ١٠/ ١٩٧٧ شەهید سەعدی گچکەو هەڤاڵ مەلا بەختیاریش گەیشتنە دۆڵی مەقۆلی.. لەوێ چاومان بەوان کەوت، لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بە بیرەوەرییەك بدەم ئەویش ئەوەیە:-

لەگەڵ هەڤاڵ مەلا بەختیارو برادەران لە هەمان ئەشکەوت دانیشتبووین لە نزیك گوندی ماوەسەری گەورە ، کە هەواڵی مام جەلالیان پێگەیشت بە هۆی شەهید نامق، کاك مەلا بەختیار داوای کرد چەند برادەرێك بچن بۆ ناوچەی سلێمانی و نامەیەکی بەڕێز مام جەلال هەیە بیدەنە دەست شەهید ئارام . کەس ئامادەیی نیشان نەدا.. پاش ماوەیەك من ئامادەیی خۆم نیشاندا کە بچم ئەو نامەیە بگەیەنم، لەگەڵ کاك ئازاد خۆشناو بەڕێ کەوتین چەندین شەو و ڕۆژمان پێ چوو لە بیرمە لە ١٧/ ١٠/ ١٩٧٧، گەیشتینە گوندی چوخماخ لەوێش بۆیاخ سەمەر، بەهەر حاڵ شەهید ئارامان نەدۆزیەوە.. بڕیار وابوو ئەگەر کاك ئارام نەدۆزرایەوە ئەوا بە هۆی کاك حامید، کە کادیرێکی تێکۆشەری ناوچەکەبوو ڕەوانەی سلێمانی بکەین، وامانکرد، جا نازانم نامەکە چۆن گەیشتە دەست شەهید ئارام ، کاك غەریب هەڵەدنی لەگەڵمان هاتەوە تا حاجیتان و بەڕێی کردینەوە بۆ ناوچەکەی خۆمان.

## هێرشەکانی دوژمن

پاش ئەوەی جاڕ درا لە گوندو شارەکان، کە چەك گەیشتۆتە دەستی پ ـ م، دوژمن ویستی ئەو دۆخە لەبار ببات لە ناوەڕاستی مانگی ١٠ تا کۆتایی مانگی ٤ ی ١٩٧٨ دەیان هێرشی یەك لە دوای یەکی کردە سەر هەموو ناوچەکانی کوردستان لە ناوچەکانی ئێمە تووشی چەندین شەڕ بووین، بەڵام لە هەموویاندا هێزی پ ـ م سەرکەوتووبوو شکستی گەورەش بەر حکومەت کەوت، شەڕی سناوە کەلەویّ کۆپتەرێك پێکراو چەندین خۆفرۆش کوژران، شەڕی جەلی، کە تاکو ئێوارە بەرامبەر دوژمن شەڕکرا شەڕی هەوری، کە زیاتر لە (٢٠) کۆپتەر بەشداری تیاکرد حکومەت هیچی پێنەکرا شەڕی حاجی قەڵاو قاز بەگیان، کە دوژمن لە چەندین لاوە هێرشی کردو بەبەر چاوی خەڵکی دڵسۆزی دەشتی کۆیەو دۆکانیش بینرا دوژمن چۆن مەلوولانە گەڕایەوە .. هێرشی پ. م بۆ سەر گوندی حەسەن مترب لە ناوچەی دیدەوان، کە چەندین جاش کوژران سووڕانەوەی کۆپتەر بە بەردەوامی لەسەر ناوچەکان هەموو ئەوانەو گەلێکی تریش وا رەچاو دەکریّ دوژمن تەواو مەترسی لیّ نیشتبیّ .. کە شۆڕش بەرەو گەشەکردنی سەرەکی دەڕوات لە ناوچەکانی تری کوردستانیش بەهەمان شێوە.

لە مانگی ١٢ ی ١٩٧٧ و مانگەکانی (١) و (٢) ی ١٩٧٨ ڕۆژێك نەبوو هێزی دوژمن ناوچەکانی نەپشکنیّ بەڕاستی شەڕی پارتی زانی دلێرانەمان لەگەڵ کردن ئێمە ماوەی (٣) مانگ لەگەڵ شەهید سەعدی گچکەو سەید کاکە و مەلا بەختیار بووین، بۆ زانینی هەموو خەڵکی بە ستەم دیدەی کوردستان لە دۆڵی بالیسان تاکو دەشتی هەولێر و قەراج هەموو ژمارەمان لە (٩٠) پ ـ م تێنەدەپەڕی.

زستانێکی یەکجار سەخت‌وناخۆش بوو بۆمان، پشومان نەبوو، ڕۆژ هەبوو تاکو ئێوارەو لە ئێوارەش تاکو بەیانی باران وەکو شەستیر دەهاتە خوارێ جا نازانم چۆن ماوین، لەچەندین گوند شەو دەورمان ئابڵوقە دراو چەندین تێکۆشەرمان شەهید بوون، چەندین بیّ وورەو ترسنۆك خۆیان دایەوە دەست دوژمن ، بەڵام بە هیمەتی هەموو ئەو کوڕە بەجەرگانە ئەو زستانە پڕ ئێش و ئازارەمان بڕی.

هیچ گوندێك، ڕەشماڵێك، هۆبەیەك، کوتانێك، چیایەك، ئەشکەوتێك، دۆڵێك، بن بەردێك، کانیاوێك‌و چەمێك، ڕەزێك، لوتکەیەك، نەما دوژمن سەری پێدا نەکردبیّ. دەباشە ئێمە لەکویّ بووین ..؟ هەڵبەت هەر لە کوردستان. هەر لە ناوچەکانی خۆمان‌و هەر لەو شوێنانە، کە دوژمن

بەشێ پێشتر پشکنی بووی چەندین پێشمەرگەمان تووشی نەخۆشی بوو چەندین پ ـ م چەکی خەلو توانای ئەو باردۆخەی نەما.. لەو ماوەیە چەندین جار بەرەو ئاوەگردو باواجی لەوێش بەرەو دەشتی هەولێر ئینجا دەشتی کۆیە جەولەمان دەکرد.. دوژمن چەندەها ڕۆژو شەو لە هەموو گوندەکان دەمایەوە تاکو ئێمە نەتوانین نان‌و پێویستیەکانمان جێبەجێ بکەین گێلیەتی دوژمن گەیشتبوە ئەو ئەندازەیە، کە جووتیارو پێشمەرگەی لێک جیانەدەکردەوە بێ ئاگا لەوەی، کە پێشمەرگە کوڕی جووتیارانی کوردە، بە تاریکی ئەنگوستە چاو نان‌و خواردنیان دەگەیاندنێ‌و هەمیشە جووتیارەکان پشتیوانی ئێمە بوون، لەولاش کە بەڕێز مام جەلال‌و برادەران بەناو خاکی ئێران دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ نۆکان لە ڕێگا لەگەڵ ژەندرمەی ئێرانی تووشی یەکتر هاتن بەڵام ژیری‌و هوشیاری برادەران ئەو بۆ سەیەی دوژمنیان هەڵوەشاندەوە، ئێرانییەکان نەیانزانی بەڕێز مام جەلال لەگەڵ ئەو هێزەیە.. ئەگینا ڕەنگ بوو تووشی گیروگرفتی گەورەتر بونایەوە .

هەر چەندە هەندێ فەرمانـدەی تێکۆشەرو ڕەسەنمان لەو زستانە لە دەستدا بەڵام ئێمە سەرکەوتین‌و دوژمن شکا چونکە شۆڕش هەر بەردەوام بوو، کە لەلای ئێمە هەموو شتێك بوو.

لە ٢٣/ ٢/ ١٩٧٨ لە نزیك گوندی چاڵە گردەڵە لە بناری دێدەوان، هەڤاڵ سەعدی داوای کۆبوونەوەی کرد، کە لەم هەڤاڵانە پێك هات:-

١ـ سەعدی گچکە، ٢ـ سەید کاکە، ٣ـ ڕێباز، ٤ـ قادر عەزیز، ٥ـ جەمال کوردە، ٦ـ قادر مستەفا، ٧ـ جەوهەر سەعید.. باسی بارودۆخەکەی کردو ڕێ‌و شوێنی تازەی دانا، بڕیارمان دا لە یەکتر جیا ببینەوەو مەفرەزەکان ژمارەیان کەم بکەین لە ئێوارەی هەمان ڕۆژ کاك سەعدی‌و سەید کاکەو قادر عەزیز ڕۆیشتن. بۆ دواجار خوا حافیزیان لە شەهیدی نەمر کاکە سەعدی کردو لە ٨/ ٣/ ١٩٧٨ لە دەشتێو لەو شەڕە قارەمانانە لەگەڵ نزیکەی (٢٠) پ. م ی قارەمانی تر شەهید کرا.

شەڕی دەشتێو بوونی هێزی پێشمەرگەی بەرامبەر بە دوژمن سەلماند.. ئازایەتی و قارەمانیەتی کوڕەکانی دەشتی هەولێری بە کۆمەڵانی خەڵك ناساند، مەکتەبی سیاسی بەڕێز بەبلاوکراوەیەك ئەو هەواڵە دڵتەزێنەی بۆ هێزی پێشمەرگەو جەماوەری گەلەکەمانی ڕاگەیاند.

شەهید بوونی کاك سەعدی‌و هەڤاڵەکانی کەلێنێکی یەکجار گەورەی دروست کرد.. بە تایبەتی لەناوچەی دەشتی هەولێر. کاك سەعدی پیاوێکی ئازاو چاو نەترس، ناسراو و جێ متمانەی خەڵك‌و پێشمەرگەو فەرماندەو سەرکردە، لەدەست دانی کادرێکی وا کارێکی وا ئاسان نیە.. بەبیستنی هەواڵی شەهید بوونی..! هەمورمان تاساین..!

دوژمــن هەڕەشــەی دەکـرد، کـە ئێمـەش دەگەیەنێتـە چارەنووسـی ئـەوان.. شـەهید سـەعدیو هەڤاڵەکانی فاروق سدیقو فەرخو ئەحمەد چەمەرگەو فەریقو سەید حوسێنو باقی شـەهیدانی تـر وانەیەکی گەورەیاندا بەدوژمن بـە شـاهێدی دۆسـتو دوژمنـان، شـەڕی (دەشـتێو) یەکێکـە لـە نموونەی هەرەبەرزی قارەمانیەتی هـ. پ. ك دەبـێ هـەموو شـەڕێك بگەڕێتـەوە دۆخو کـاتی خـۆی ئەوکات دوژمن بەدەستی بـەتاڵو هێزێکـی مـۆدێرینو پـڕ چـەكو کەرەسـتە.. شـەڕکردن لەگـەڵ هێزێکـی ئـەئاوا، کـە هەنـدێ دەنگوبـاس رایگەیانـد کـەمتر لـە (٣٠٠) سـەربازی دوژمـن کوژراوە.. کارێکی وا ئاسان نیە..! شەهید سەعدی بەرەو سەرکردایەتی دەڕۆیشت بـۆ ئـەوەی لـە کۆبوونەوە بەشداری بکات لە (دەشتێو) تووشی ئەم شەڕە هاتنو شەڕ لەبەیانی پێش ڕۆژهـەڵات تاکو ئێوارە بەردەوام بوو.. ئەگەر تێکۆشەران لە مردن بترسن، لە ماندوبوون بترسـن، دوژمـن بـە هێزو توانا دابنێن شۆڕش کردن دەبێتە کاری مـەحاڵ.. دەبێ ئەو ڕاستیە درك پێبکەین هەر چەند دوژمن بەهێزو نەقولاّبێ، بەرامبەر بە تێکۆشەران زەبوون و لاوازە ئەوانـەی بـۆ مـەرامی خۆیـان دەستەلاّت دەگرنە دەست، ئەوانە هەمیشە چاویان لە پلەو پایەیە، ئەوانە هەمیشە قازانجی خۆیان دەخەنە پێش بەرژەوەندیەکانی میللەت بەرامبەر بە تێکۆشەران نـاتوانن خۆیـان ڕابگـرن.. ئەگـەر بە ژمارەشیان بەراورد نەکرێن.

ڕاستە دوژمن تۆپو فڕۆکەو سـەربازو کۆپتـەرو تـانگو جـاش پـارەو ئـەمنو ئیسـتخباراتو موخابەراتی هەبوو بەلاّم ئەوانە هـەمووی بەرامبـەر چـەکی بیروبـاوەڕ تێـك دەشـکێ، پێشـمەرگە سەرەتاکان هەر شەڕی (دەشـتێو)یـان نـەکردووە، بـەڵکو چـەندین داسـتانی قارەمانانـەی تریـان تۆمار کردووە.

## شەهید سەعدی گچکە

شەهید سەعدی عەزیز لە شۆڕشی ئەیلول بەشداری کاریگەرانەی کردووە ، لە بەتالیۆنی (٢) هێزی دەشتی هەولێر سەر لق و پاشان کرا بە فەرماندەی بەتالیۆن لە هێزی قەندیل.

شەهید لە ٨/ ٨/ ١٩٧٦ لەگەڵ دەستەیەك لە تێکۆشەران چوون بۆ قەندیل.

شەهید ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان‌و ئەندامی سەرکردایەتی ی. ن. ك و فەرماندەی هەرێمی (٨) دەشتی هەولێر بوو شەهید سەعدی گچکە فەرماندەی دەیان شەڕو داستانی کردووە، کە دوژمن پێش دۆستان گەواهی ئازایەتی ئەو ڕۆڵەی داوە.

شەهید لەشەڕی دەشتێو لە هەل‌و مەرجی ئەو کات لە نموونە هەرە بەرزەکانی ئازایەتی نیشان داوە.

لە بەرواری ٨/ ٣/ ١٩٧٨ شەهید کرا لەگەڵ (١٤) چواردە تێکۆشەری تری گەلەکەمان.

شەهید سەعدی یەکێك بوو لەو کەسانەی، کە زۆر واقیعیانە بیری دەکردەوە.

شەهید حەزی دەکرد هەموو کورد لەژێر یەك ئاڵا کۆببێتەوە تا تووشی شەڕی لابەلا نەبین، داخەکەم ئەو هیوایەی ئەو هێشتا نەهاتووتە دی..!



شەهید
سەعدی
گچکە

## کۆبوونەوەی سەرکردایەتی لە نۆکان

سەرکردایەتی ی. ن. ك لە زستانی ١٩٧٨ دا بارەگاکانی هێنا بۆ ناوچەی قەڵادزە دیارە ئاگاداری هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کرابوەوە.. کە بچن بۆ کۆبوونەوە، ناکۆکیەکان لەگەڵ پارتی گەیشتبوە ڕادەیەك.. کە پێویستی بە هەڵویست وەرگرتن هەبوو چەند کارەساتی ناخۆش‌و دڵتەزێن ڕووی دابوو لەوانە شەهید کردنی مولازم حسەن خۆشناو لە تورکیاو گرتنی (١٠) دۆشکای ی. ن. ك و بەتاڵان بردنی چەندین هەزار دیناری عێراقی، شەهید بوونی مەجید هەیبە لە کانی سووری دەشتی کۆیەو زۆر ڕووداوی تری لەم بابەتە کە ئێستا فرمێسکی پەشیمانی بۆ دەڕێژرێ..!

ئێرانیش هەر ڕۆژە بە بیانویەك دەیویست زەبرێك لە ی. ن. ك بدات. مەسەلەیەکی تری زۆر گرنگ هاتە پێشەوە ئەویش چەسپاندنی هـ.پ.ك لە بادینان، چونکە شوێنێکی ستراتیژی گرنگە بە ئاسانی چەك‌و تەقەمەنی‌و پێویستیەکان لە سوریاوە دەگاتە شۆڕش، جگە لەو کێشانەش دوژمن هەڕەشەی گواستنەوەی گوندەکانی سەر سنووری دەکرد بە قوڵایی (٢٠)کم، کە چۆڵی بکات.

ڕێکخستنەوەو پێداچوونەوەی بڕیارەکانی ساڵی پێشووی کۆبوونەوەی سەرکردایەتی پێویستی بە کۆبوونەوەیەکی تر دەکرد، شەهید بوونی چەندین سەرکردەی لێهاتوو زیرەك‌و چالاك.. جێگا پڕکردنەوەیان یەکێك بوو لە خاڵە گرنگەکانی کۆبوونەوەی داهاتوو.. جگە لە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان باڵەکانی ناو ی. ن. ك.

لەپاش شەڕەکەی دەشتی کۆیە (شیوئاشان ـ قاز بەگیان)لە ١٩٧٨/٢/٣ تا ڕۆژی ٤/ ٢/ ١٩٧٨ کاك مەلا بەختیار گەڕایەوە بۆ ناوچەی سلێمانی.. هەندێ کادری ناوچەی دەشتی هەولێری لەگەڵدا ڕۆیشت لەوانە شەهید عەلی ساڵح شەهید هاوڕێ کاوەوکاك شاخەوان. ئێمە لە دەشتی هەولێر بووین، بەهارێکی خۆشوو دوژمن کەمتر هێرشی دەکرد بڕوای خەڵك بە شۆڕش بەهێزتر ببوو، ڕۆژ بەڕۆژ هـ.پ.ك لە گەشەکردن دابوو گومان لەوەدانیە لەکاتی سەرکەوتن زۆر کەس دێتە پێشەوە بەرێك‌وپێکی شۆڕش دەکات لەکاتی شکان‌و نوجدان‌و نشێوو هەورازو ناخۆشی بەجارێ ورە بەردەدات هەندێ جار تووشی ڕوو ڕەشی‌و خیانەتیش دەبێت ! ئەگەر سەیری ڕووداوەکان بکەین ئەو ڕاستیەت زۆر بە چاکی‌و زۆر بە ئاشکرا بۆ یەکلا دەبێتەوە.. تا هێزی

پێشمەرگەی ی. ن. ك لە بادینان تووشی شکستی نەببوو.. زۆر خەڵك پشتیوانی لێدەکردین، کە تووشی شکستی هاتین نەك هەر لە یەکێتی دوور دەکەوتنەوە! بەڵکو جارجار تاوانبارێشی دەکرد.

بەڵام کە سکرتێری کۆمەڵەکەمان و ئەو پیاوە کارامەو زاناو لێوەشاوەیەی شەهید کرابوو..! پێویستی دەکرد کۆمەڵە کۆبوونەوەیەکی فراوانی خۆی ببەستێ.

چۆن یەکێتی پێویستی بە بڕیاری نوێ هەبوو ئەوەهاش کۆمەڵە خاڵێکی گرنگ و کۆڵەکەی یەکێتی بوو پێویستی بەبڕیاری نوێ هەبوو هەڵوێستی تازە وەربگرێ لەوبارودۆخە تازەیە، وە هەم کادرو ڕێکخستنەکانی خۆی هەڵسەنگێنێ و ڕێ و شوێنی ڕێکخستن و پێشمەرگایەتی نوێ بگرێتەوە.

کۆبوونەوەی فراوانی کۆمەڵە لە نۆکان بەسترا جێگای داخە لەبەر هەل و مەرجی ئەوکات نەمتوانی بەشداری تیابکەم، لەو کۆبوونەوەیە کاك نەوشیروان بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵ بژێردرا وە سەرکردایەتیەکی نوێ بۆ کۆمەڵە هەڵبژێردرا. بەبڕوای من کاك نەوشیروان پیاوێکی وا بە ئەزموون و شارەزاو دووربین و پێشبین، تێکۆشەرێکی کۆنی گەلی کورد، ئەدیبێکی ناسراو کادرێکی لەجێی خۆی بوو، کاك نەوشیروان ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا بۆئەوەی کۆمەڵە بتوانێ ڕەگی خۆی لەهەموو کوردستان دابکوتێ، کوردستانیەتی کۆمەڵە، یەکخستنی بیرو بۆچوونە جیاجیاکان بەتەواوی چەسپا.

- مەترسی پارچە پارچە بوونی بزووتنەوەی کوردایەتی هیمەتی زۆری کاك نەوشیروانی تیابوو بە هاوکاری بەڕێز مام جەلال، کە لە پاشان لە باس کردنی کۆنفرانسەکانی کۆمەڵە دێینەوە سەری.

سەرکردایەتی ی. ن. ك لە مانگی ٤ ی ١٩٧٨ کۆتایی بە کۆبوونەوەکانی خۆی هێنا.. زۆر بڕیاری گرینگی دا، لەوانە ڕۆیشتن بەرەو بادینان، گواستنەوەی سەرکردایەتی بۆ شوێنی پار، کە لەسێ سنوور بوو.. لە ناوچەی خواکورك.

**هەڵبژاردنەوەی ئەندامانی سەرکردایەتی ی.ن.ك بەم شێوەیە بوو :**

١. بەڕێز مام جەلال سکرتێری گشتی ی. ن. ك.
٢. کاك نەوشیروان ئەندامی م. س ی. ن. ك و کۆمەڵە.
٣. کاك سالار ئەندامی م. س ی. ن. ك و کۆمەڵە.
٤. شەهید عەلی عسکەری ئەندامی م. س ی. ن. ك و بزووتنەوە.
٥. شەهید تایەر عەلی والی ئەندامی م. س ی. ن. ك و بزووتنەوە.
٦. شەهید د. خالید سەعید ئەندامی سەرکردایەتی و (هـ. گەرۆك) بزووتنەوە.

٧. كاك ڕسوڵ مامەند ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە.

٨. خوالێخۆشبوو عومەر مستەفا ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە.

٩. کاك سەید کاکە ف. ه. (٨) بزووتنەوە.

١٠. كاك مەلا ناسیح ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە.

١١. كاك مەلا بەختیار ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە ف. ه (١).

١٢. كاك ملازم عومەر ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەو ئەندامی م. ع.

١٣. كاك تاڵب ڕۆستەم ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمی ٦ و کۆمەڵە.

١٤. كاك د. فوئاد مەعسوم (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

١٥. كاك د. کەمال فوئاد (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

١٦. كاك د. کەمال خۆشناو (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

١٧. كاك عادل موراد (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

١٨. كاك عەبدولڕەزاق فەیلی (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

١٩. كاك شێخ حوسێن بابە شێخ یەزیدی (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

٢٠. كاك د. خدر مەعسوم (ئەندامی سەرکردایەتی - خەتی گشتی).

لە دەوروبەری مایس لە ٢٨ /٤/ ١٩٧٨ عەلی ساڵح‌و کاك شاخەوان هاتنەوە دەشتی هەولێر تەواوی دەنگ و باسەکانیان بۆ گێڕامەوەو نامەیەکی کاك نەوشیروانیان بۆ هێنابووم، لەگەڵ زۆر بڵاوکراوەو دەنگ‌و باسی جیا جیا، زۆر بە درێژی باسی چوونە بادینانیان کرد، کە بڵاوکراوەکانم دەخوێندەوە.. سەرم سوڕما ئەوەندەی باسی قیادە موئەقەرگیزەی دەکرد باسی حکومەتی تیا نەنووسرابوو، من یەکسەر بۆچوونی خۆمدا، داخی گرانم مل هوڕی‌و نەزانی هەندێ لە هاوڕێیانی خۆم وایان دەکرد.. کە ڕاستیەکان هەندێ جار بشارمەوە، چوونە بادینانم زۆر بە خراپزانی..! بە کاك شاخەوان‌و ئەوانم وت: دەشکێین.

هەموو ئەو کەسانەی، کە زانیارییان دابووە سەرکردایەتی لەسەر بارودۆخی بادینان هیچی ڕاست نەبوو.. هەمووی بۆ قازانجی خۆیان زانیارییان دەدا.

نامەوێ لێرە بە وردو درشتی ڕووداوی هەکاری بگێڕمەوە چونکە هیچ بەرژەوەندیەکی گەلی کوردی تەنیا نیەو نامەوێ برینەکان بکولێنینەوە.. ئەوەندە دەڵێم: شەڕی برا کوژی لە کوردستان هیچ قازانجی تیا نەبور هیچ کەسێك خۆی بەسەر کەوتوو یان باڵادەست نەزانی، لەو شەڕانەدا

ههموو ژێرکەوتین ئەوەندە دەڵێم لە ١٩٧٨/٤/٢٧ هێزەکانی ئێمە بەرێ کەوتین لە کۆی گشتی هێزلر پ. م تەنیا (٨) پ. م گەڕایەوە.

داوا لە هەمووان دەکەم ئەوەی دەیەوێت لـە کێشـەی هـەکاری بگـات نامیلکـەی (کارەسـاتی هەکاری) لە نووسینی کاک نەوشیروان بخوێنێتەوە.

ئەو بڵاوکراوانەی، کە بەدەستمان گەیشت: بڵاوکراوەیەك، کە بەیانی م. س بوو لەسەر شـەهید کردنی کاک ئارام، زۆر خەمم خوارد، زۆر دڵگیر بووم چۆن لە بارودۆخێکی ناسکدا ڕۆڵەیـەکی وا تێهاتووی گەلەکەمان لە دەستدا..!

لە قسـەی بـرادەران.. نێـوان کۆمـەڵـەو بزووتنـەوە زۆر نـاخۆش بـوو، کـاك عـەلی عەسـکەری و هاوڕێکانی خۆیان بە باڵا دەست دەزانی، غەدرو ناحەقییان لە کۆمەڵـە دەکـرد.. بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆش بوو چونکە بڕوام وابوو بزووتنەوە لـە گەرمـەی خـەبات ئەوەنـدە بڕناکـات، نـاتوانێ و شایستەش نیە سەرکردایەتی شۆڕشی لە ئەستۆ بێت، بـەڵام (العین بصیرە والید قصیرە) لـە ناوچەکەی ئێمە سێ ئامرکەرتیان دانابوو (١) شەهید قادر مستەفا (٢) شـەهید عـەلی سـاڵح (٣) شەهید سلێمان بیرێژی. کاك شاخەوان و ڕێباز، کادری کۆمەڵە بوون.. فەرماندەی هـەرێمی (٨) کاك سەید کاکە بوو.. ئەویش بزووتنەوە بوو.

پاش کارەساتی هەکاری، نێوان بزووتنەوەو کۆمەڵە زۆر لێڵ و تاریك بوو، ناکۆکیەکان ڕۆژ بـە ڕۆژ بەرەو تەقینەوە دەڕۆیشت، یەك ڕاستی هەیـە دەبـێ بیڵـێم: هەنـدێ لـە کـادیرانی بزووتنـەوە بڕوای تەواویان بە پارتی هەبوو لەبەر هـەڵ و مـەرجی ناوچـەیی ئـەو کـات.. بـە نـاوی بزووتنـەوە کاریان دەکرد.

مەفرەزەکانی بزووتنەوە پاش کارەساتی هـەکاری.. لـەجیاتی ئـەوەی لەگـەڵ پـارتی تونـدترین هەڵوێستێك وەربگرن.. بە پێچەوانەوە هەڵوێستی زۆر نەرم و هەندێ جار بە ئاشکرا بەناوی پارتی کاریان دەکرد، زۆر نموونە لەو بابەتەمان هەیە.

کەچی شەهیدانی هەکاری زۆر بەیان سەرکردەکان بزووتنەوە بوون بەڕاستی سەیرە!

کتێبە گـەورە بەقەبارەکـەی د. مـەحمودیش گەیشـتە کوردسـتان یـەکجاری ئاگرەکـەی خۆشـتر دەکرد.

# چیمان بەسەر هات

لە هەکاری چەندین ئەندامی سەرکردایەتی‌و فەرماندەی لیوەشاوەو ئازاو چالاکی هـ. پ. ك، چەندین کادرو پ. م. ی چالاك، شەهید بوون، چەندین بەدیل گیران، هەندێکیش تەسلیم بەرژێم بوونەوە.

شەهید عەلی عەسکەری، شەهید تایەر عەلی والی، شەهید د. خالید، شەهید ئازاد هەورامی‌و کاك ملازم عومەرو کاك سەید کاکە شەهید حوسێن یەزیدی، تالّب ڕۆستەم.. ئەوانە! ئەندامانی سەرکردایەتی بوون بە تێکڕایی گیران..!

لە هەزار پ. م ٨ پ. م بە سەلامەتی گەڕانەوە، لەوانە هەڤاڵ حەمەی حاجی مەحموودو شەهید جەمال عەلی باپیرو (٦) پ. م، کە بەداخەوە لەبەر دۆخی سەختی پارتیزانی ئەوکات ناوەکانیان نازانم، کە جێگای ڕێزن، چونکە هەزار کۆسپیان تووش هات.. تا گەیشتنەوە ناوچەکەی خۆیان.

عێراق، تورکیا، ئێران، سێ دوژمنی گەلی کورد سێ دەوڵەتی ناوچەکە، هەموو هێزو توانایان خستە گەڕ.. بۆ لەناو بردنی ئەو شۆڕشە، ئەو ئومێدەی گەلی کورد.. هەرگیز شتێکی سەیر نەبوو لەلای تێکۆشەران، چونکە ئەو سێ دەوڵەتە.. نیگەرانن بەهەر جوڵانەوەیەکی کوردایەتی جا لەهەر پارچەیەك بێت، بەڵام هەمیشە داخ بۆ خۆمان دەخۆم.

لێم مەگرن گەر بڵێم مەترسی هەندەی نەمابوو هەموو (ڕیسەکمان لێبکەنەوە بە خوری) ئەوەی دوو ساڵ بوو دروستمان دەکرد خەریك بوو لە بنەڕەتەوە هەڵی وەشێنین، ئێمە لە ڕەتڵی سێیەم بووین.. بەرەو بادینان لە ١٩٧٨/٥/١٥ لەگەڵ شەهید سەید کەریم لەناوچەی خۆشناوەتی یەکترمان گرتەوە، نیازمان وابوو بەرێ بکەوین بۆ بادینان، ئەو پێشمەرگانەی، کە لە ناوچەکە بووین ئەم ناوانە بوون: ١ـ شەهید سەید کەریم، ٢ـ شەهید عەلی سالّح، ٣ـ شەهید قادر عەولاّ، ٤ـ ئەسعەد حەمەد، ٥ـ عەلی حەمەد، ٦ـ نەریمان، ٧ـ ئازاد خۆشناو، ٩ـ هێمن خۆشناو، ١٠ـ شەهید عەبدوللاّ سادق (منالّ بوو لەبەر خۆشەویستی ناومان نابوو هەوڵارە)، ١١ـ ڕێباز، ١٢ـ د. خدر مەعسووم.. چەند ڕۆژێك لە خۆشناوەتی ماینەوە برادەرێك هاتە لامان.. هەواڵی شەڕەکەی هەکاری پێ ڕاگەیاندین زۆر بڕوامان نەکرد.

کاك شەهید سەید کەریم بڕیاریدا چاوەڕوان بکەین وتی: مادام شەڕبووە دیارە کاك نەوشیروانیش هیچ هەواڵی نیە ئێوە بگەڕێنەوە دەشتی هەولێر لەپاشان نامەتان بۆ دەنووسم، لە ڕۆژی ١٩٧٨/٦/١٢ گەیشتینەوە دەشتی هەولێر.. لە کاتێك هێزەکانی ئێمە هەموو تەفروتونا

حو- لەگەڵ شاخەوان لەماڵی ئەندامێکی دڵسۆزی حشع لە گوندی ئۆمەر گونبەت لەماڵی کاک عەلی رەسوڵ دابەش بووین، کاک عەلی وتی: شەڕ بوو لە نێوان هێزەکانی ئێوەو (قیادەی موتەمەرگیز) لە هەکاری‌و د. خالیدو عەلی عەسکەری یان شەهید کراون یان بەدیل گیراون..! یەکتمان ورما..! من باوەڕم پێکرد چونکە پیاوێکی ڕاست گۆبوو، کاک عەلی رەسوڵ وتی: برادەرانی (حشع) لەشار وادەڵێن ڕۆیشتین چەند ڕۆژێکی پێ چوو، برادەرێکمان گۆڤارێکی عەرەبی بۆ هێنایین لەگوندی ئاومار باسی تەواوی شەڕەکانی کردبوو.. وێنەی مام جەلال‌و طالەبانی‌و د. خالیدو عەلی عەسکەری‌و کاک مەسعودی تیابوو، بڕوای تەواوم هەبوو شتەکان ڕاست بوون.

ئێمە، کە زۆر خوێن گەرم بووین، چارەنووسی خۆمان بەو شۆڕشەوە گرێدابوو، میللەت هەموو چاوی لەوچەند پێشمەرگەیە بوو.. دەباشە ئێمەی وادوور لەبن دەست‌و پێی ڕژێم دەبێ چارەنووسمان بۆ کوێ بڕوات..؟ کەوتمە خەیاڵێکی دوورو قووڵ، ناحەزانی کوردو ی.ن.ك بە گەرمی پڕوپاگەندەیان دەکرد، کە گوایە مام جەلال‌و کاک نەوشیروان لەبەر ئەوەی کەسیان لەگەڵ نەماوە- ڕۆیشتوون بۆ ئەورووپا بەڕاستی بڵێم دەیان وت: هەڵاتوون..!

بزووتنەوەی خۆشمان، کە هەتا دوێنێ دۆست‌و هاوپەیمان‌و یەک سەنگەر بووین هەرچی لە دەستیان هات لە دژی کۆمەڵە بەتایبەتی لەئێمە کردیان، زۆریشیان بەهەڵە داوان چوونەوە ناو حکومەت‌و خۆیان نەگرت.

هیچ دەنگ‌و باسێکی تەواومان پێنەگەیشت ئەوەی زانیمان هێزەکانی ئێمە تەواو تیاچوون، لە ڕێگای ئەوانەی کە تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە لە شەڕەکەدا دەقی ڕووداوەکەمان پێگەیشت، ئێمەش بڕیارماندا ئەگەر مام جەلال‌و نەوشیروانیش لە کوردستان نەمابن ئێمە درێژە بە کارەکانی خۆمان دەدەین، ئەگەر بزووتنەوە ویستیان لێمان بدەن ئەوا دەڕۆین بۆ ناوچەیەکی تر.

وتمان کادر دەبێ لەکاتی نەمانی سەرکردایەتی بتوانێ ئیش‌وکاری خۆی ئەنجامبدا.. ئەوکات دەردەکەوێت..! تا چ ڕادەیەك دەتوانێ سەرکردایەتی ناوچەکەی خۆی بکات، بەو گیان‌و بەو هیممەتە، بەو مەبەستە کارەکانی خۆمان بە ڕێك‌و پێکی کردەوە، هەموو دوژمنێکمان بەهیچ نەزانی.

پێویستە گەواهی ئەو ڕاستیە بدەم‌و بڵێم : هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرمان لەوە نەکردەوە کە گۆڕەپانی خەبات چۆڵ بکەین بۆ ماوەیەکی زۆر ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ سەرکردایەتی پچڕا، بێ پارە، بێ فیشەك، بێ چەك، خەڵکی تێکۆشەری ناوچەکە زۆر پشتگیری کردین، لە ناخۆشترین

کات بەهانامانەوە هاتن، ئێمەیان پاراست، برادەرانی تر لەجیاتی ئەوەی ئاخ بۆ ئەو دۆخە نا لەبارە هەڵبکێشن زۆریان پێ خۆش بوو، دەست کرا بە ڕاوە ڕووت، پاشا گەردانی لەناو شۆڕش پەرەی سەند ڕژێم بە ئاشکرا پیاوی خۆی خزاندە ناو ئەو مەفرەزانە، کەس لە کەس دڵنیا نەبوو.. پ. م کوشتن ببوە کاسپی، بە هەر حاڵاً بەری تەنگانە کورتە.

ئەو کەسانەی ڕاوە ڕووتیان گرتە بەر چارەنووسیان بەستەوە بە ڕژێم، ئەوانەی ڕێبازی ڕاستەو دروستی کوردایەتیان ڕەچاو کرد.. لە مەیدانی خەبات مانەوە درێژەیان پێدا.. تا سەرکەوتن، ئێمە چەند کادرێك لە ناوچەکەی خۆمان پەیڕەوی ئەوەمان کرد، کە دەڵێ: لە کاتی نەبوونی سەرکردایەتی هەمیشە دەبێ کادرەکان خۆیان بە سەرکردەو فەرماندە بزانن. تەنیا ڕۆژانی دژوارو ناخۆشی پیاو دەخاتە ژێر تاقیکردنەوە، هەر ئەو تاقیکردنەوەیە دەبێتە سەنگی مەحەکی پیاوی دلێر، لەو کاتو ساتەدا کاك سەید کەریمیش لێی بێ ئاگا بوو.

لە پاشان زانیمان کەوا مام جەلالو کاك نەوشیروانو کاك د. مەحموود لە چیای قەندیل خۆیان شارۆتەوە ئەگەر هیمەتو دڵسۆزیو چالاکیی کاك قادر خەبات نەبوایە لە برسان گیانیان لە دەست دەدا.

ڕزگار بوونی گیانی ئەم سەرکردانە بە هیمەتی ئەم تێکۆشەرە قادر خەبات بوو، پێویستەکوردو شۆڕشەکەیو ی.ن.ك ئەو ئازایەتیەو ئەو دڵ پاکیە هەرگیز لەبیر نەکەن، داخەکەم پیاوی واش هەیە کە خۆی لەگەڵ ئەو ڕووداوانە نەژیاوە ئێستا گاڵتە بە تێکۆشەری وا دەکاتو هەزاران تیرو توانجیشی بۆ دەهاوێ، وا چاکە تێکۆشەرە ڕاستەقینەکان وەفادارین بۆ هاوڕێو هاوسەنگەرەکانیان.

بەڵێ ئەو چەند مانگە بێ سەرۆك دەسوڕاینەوە.. بەڵام بە گیانێکی شۆڕشگێرانەو هیوایەکی یەکجار مەزن، تاکو ناوەڕاستی مانگی ٩ی١٩٧٨ لەپڕ کاك سەید کەریم بە دوایدا ناردین.. پاش ئەوەی، کە بۆمان ڕوون بۆوە، کە هەموو جل بۆرێك پ. م نییە..! لەچیای ئاوەگرد لەگەڵ شێرەکوڕ (سەید کەریم) یەکترمان گرتەوەو کاغەزێکی دەرهێناو کە بە مێژووی ١٩٧٨/٧/٢٢ بەدەستو خەتی کاك نەوشیروان نووسرابوو، مام جەلالیش ئیمزای کردبوو بە درێژی باسی کارەساتی هەکاری کردبوو مام جەلال دوو دێڕی لە کۆتایی نووسی بوو، کە دەڵێ: براینە شۆڕش هەر سەرکەوتن نیە.. هەڵچوونو نیشتنەوەیە هەورازو نشێوە.. سەرکەوتنو ژێرکەوتن.. ژێرکەوتنو سەرکەوتنە هەر سەرکەوتنە.

جۆرە وەکو پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی ئەم میللەتە لەو دۆخە ئاڵۆزەدا توانیمان ئەرکی سەرشانی خۆمان بەتەواوی بکەین.

ئێمەش دەمان توانی بە بیانووی هەکاری گیرفانمان پڕ بکەین و بگەڕێینەوە باوەشی چەپەڵی ڕژێم. بەڵام منەت بەسەر کەسەوە ناکەین ئەوەی کردوومانە ئەرکی سەرشانمان بووەو وەکو کوردێك، چاوەڕوانی پاداشت لە کەس ناکەین، ئەو هەواڵە خۆشەی دۆزینەوەی سەرکردەکانمان گەلەکەمان لەخۆشیان چی بکەین، بەڵام بەداخەوە (٣) سێ سەرکردەو فەرماندەی هەرە ئازاو چالاکەکانی کوردستان کاك عەلی عەسکەری و کاك خالیدو کاك حوسێن بابە شێخ گیانیان بەخشی بە نەتەوەکەیان..! کە ئەو فەرماندانەم زۆر لا گرنگ بوون.. چونکە هەزاران ڕۆڵەی کورد لەسەر دەستی ئەوان پێ گەیشتبوون.. کاك د. خالیدم بە ڕەمزی پێشمەرگایەتی دەزانی سەربلندیان بەخێر بێت.

بڕیارمان بڕیارماندا، کە لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەم ١٩٧٨دا بەرەو لای مام جەلال بڕۆین لەوێ دۆخی تازە بزانین، ئەوەی پێویستە بگوترێ.. پاش کارەساتی هەکاری هێزەکانمان لە (٢٠٠) پ. م زیاتر نەمابوو.



## بەرەو سەرکردایەتی

ئەو موژدەیەی کاک سەید کەریم بۆی هێنابووین هەموو داخو دەردەسەری لەبیربردینەوە، ماندووبونی ڕابوردوش بوو بە ڕاهێنانێکی سەربازیو فیکریو سیاسی بۆمان، لەگەڵ هاوڕێیانی هەمیشە زیندو کاک سەید کەریمو کاک عەلی سالحو هەڤاڵن.ئازاد خۆشناو و ئەحمەد قەنبەریو محەمەد خالد قادر دۆشکاو نەریمانو دڵشادو ڕەشاد..

لەسەرەتای تشرینی ١٩٧٨ لە گوندی کۆلکەرەش بەرێ کەوتین ئەو هەموو ڕێگەیەمان بڕی.. هەوری ـ دەرەزیوە ـ کوێستانی سەربەرزی دوژمن شکێنی ساو سیووکان، ئینجا لەوێوە میوانی گوندی گوڵان بووین منی خەڵکی دەشتی هەولێر.. بەهاران وڵاتەکەی خۆم گەڵێ پێ ڕەنگین بوو بەو پایزە..! گوڵان ئەڵێی بووکە ڕازاوەتەوە..! هەنارو هەرمێو ترێو قۆخ.. هتد دەتگوت مناڵە بەدایکەوە نووساوە، بۆیە دەتوانم بڵێم:

یادت بەخێر بێت مامۆستا هێمن موکریانی .. کە دەفەرمووی :

### وڵاتی جوان و دڵ گەرم

### هەزاران جار لەبەرت مرم

دوایی زینی ئەستێروکانمان بڕی لەگەڵ تاریکایی شەو جادەی گشتی خانەقا سەنگسەرمان بڕی.. بە هەورازی گوندی بۆ کریسکانەوە هەڵگەڕاین ئەو شاخە سەختەو پڕ لە هەڵدێرە ڕێگای لێ ون کردین! ماوەی چەندین کاتژمێر لەنێوان ڕەبایەکان گیر بووین بەهۆی بەربوونەوەی بەردێکی گەورە قاچی پێشمەرگەیەکمان شکا بەناوی مامۆستا ڕەشاد، سەرەڕای مەترسی زۆرو هیلاکیو سەختی چیاکە هەڤاڵەکەمان لە دوای خۆمان ڕاکێشاو گەیاندمانە گوندی خەزێنە لە دۆڵی باڵەییان.. زۆرمان برسی بوو، کە ڕۆژهەڵات ڕەبایەکان لەسەر سەرمان بوون نەدەبوو جووڵە بکەین نەماندەتوانی بڕۆین چونکە هەڤاڵ ڕەشادمان چی تر پێ هەڵنەدەگیرا بارەگای پێشمەرگەکانی ناوچەکە بە نهێنی لە گوندی زەنگەڵین بوو، کە ماوەیەک لە خەزێنە دوور بوو، کاک سەید کەریم لەگەڵ پێشمەرگەیەک ڕۆیشت بۆ هێنانی وڵاخ مەترسی مردنمان هەبوو لەبەر هیلاکیو شەکەتی نان نەخواردن، لە ناکاو هەڤاڵێک بانگی کرد وتی: ئەوەی لە خوا غافڵە

کەڕەوەو وەرن چیتان دەوێ بیخۆن، کە سەیرمان کرد بە سەدان (قوتی موعەلەبات) بە دەیان تەنەکەیتو زۆر خواردنی تر تومەز لە ١٩٧٨/٩/١٦ دوژمن هێرشی کردبوو بۆ ناوچەکە چەکش کشانەوەی ئەو خواردنانەی بەجێ هێشتبوو، دەستمان کرد بە خواردنی نازانم چیمان خواردوو نەخوارد، پاش ئەوەی ولاخەکمان بۆ هات باری ئەویش خواردنمان برد لەگەلّ خۆمان لە ... ی ١٠ گەیشتینە بارەگا .. کاک زیرۆ ئەوکاتەی فەرماندەی هەرێمی بالەک بوو زۆر ڕێزی ... گرتین هەرچی لە توانای بوو دریغی نەکرد لە ڕۆژی ١٩٧٨/١٠/٦ خواحافیزیمان لە برادەران کردوو کەوتینە ڕێ بۆ چیای قەندیل تاکو ئێوارە ئەو ڕێگایەمان بڕی، زۆر جاران شێوە سنووری ... دەوڵەتمان دەبڕی، بەلاّم هەستمان پێنەکرد.. چونکە خاکو بەردی کوردستان هەروەك یەکە، لەکاتێکدا تووشی هێزێکی ئێرانی بووین دەوریان گرتین ئێمە (٩) پێشمەرگە بووین دوانیان بێ چەک بوون. هێزەکەی دوژمنی ئەودیو لە (١٥٠) چریكو سەرباز پتر بوون.. داوایان لێکردین، کە چەکەکانمان دابنێین.. پێشمەرگە ئەوکاتە هەست دەکات کە چەکەکەی بەرامبەر بە دوژمن بە ... بەکار بهێنێ.. ئەوان گەوج بوون نەیاندەزانی بە ئێمە دەڵێن ئیتر نابێ پێشمەرگەبن.. کە چەك بکرێین دیلو داماو دەبین .. تەسلیم بە عێراق دەکراینەوە چونکە پێش ئێمە چەند کەسیان وایلێکردبوو.

شەهید سەید کەریم، لەوێش ئازایەتی خۆی نیشاندا داوای لە ئێمە کرد سەنگەر بگرین.. سەنگەرمان گرت، کاك سەید شێر ئاسا نەڕاندییو وتی: سەروان (بەواتا نەقیب لە جەیشی عێراقی) بگەڕێوە دواوە ئەگینا وەکو سەگ دەتتۆپێنم..! کە ئەو قسەیەمان گوێ لێبوو لە کاك سەید هەموومان وەکو پڵنگی زامدارمان لێهات، ئەوان ترسانو کشانەوە شوێنی دوور لە ئێمە ئێمەش ڕێگای خۆمان درێژە پێدا.. ئێوارە لە (دەراوی گورگان) لە چیای قەندیل لە نزیك ماڵە ڕەوەند ماینەوە.. زۆر خزمەتیان کردین شایانی باسە! بەیانی بەڕێکەوتین بەنیازی ئەوەی ئێوارە لە بارەگای سەرکردایەتی پشوویەکی چاك بدەین پاش نیوەڕۆ گەیشتینە بارەگای مەکتەبی سیاسی، لە دوورەوە چەند چادرێکی بۆرمان بەرچاو کەوت، کاك سەید کەریم وتی: ئەوە بارەگای مام جەلالوکاك نەوشیروانە، ئێمەچووین بۆ بارەگای کاك نەوشیروان زۆر ڕێزی گرتینو وتی: نان بخۆن چونکە پاش کەمێکی تر دەڕۆین ئێرە زۆر ساردبوو دەچینە (دەراوی گوێز) پاش ماوەیەك بەڕێز مام جەلال هات بەخێر هاتنێکی گەرمی کردین.. باسی هەولێرو سلێمانیو گەلێ شوێنی تری کرد.

سەید کەریم لەکاتی پشوودانا چەکەکەی دانابوو.. مام جەلال بەگاڵتەوە پێی وت: سەید ئەوە چەك کراوی..؟ ئەویش یەکسەر هاتە دەنگو وتی: کەس نییە من چەك بکا لە دنیا لەباروذۆخی وا سەختو ئاڵۆزو پڕگیروگرفتدا دەبێ پ.م هەمیشە چەکەکەی لەدەست بێت نابێ تاقمو مەخزەنەکەی لەخۆی بکاتەوە شەوانیش ئێمە بەو جۆرە دەخەوتین هەمووی ماوەی کاتژمێرێك لەوێ ماینەوە ئینجا بەرێکەوتین بۆ دەراوی گوێز.

ئێمە لەگەڵ مام جەلالو کاك نەوشیروان بووین ئەرکی بارەگا گواستنەوەمان لەسەر نەبوو.. چونکە تازە گەیشتبووین، مام جەلال هەمیشە نوکتەو قسەخۆشەکانی ناوچەی خۆشناوەتی دەگێڕایەوە، لەو ڕێگایە کاك د. مەحموودو شەهید سەید سەلیمو شەهید وەسمان بەگمان لەگەڵ بوو، هەروەها ئەندامی م.س کاك جەعفەریشمان هاوڕێ بوو بۆ ئێوارە گەیشتینە هەواری نوێو بارەگامان ڕێکخست لەپێش ئێمە کاك ڕەسوڵو برادەرانی تریش لەوێ بوون.

ماوەی دوو مانگو هەشت ڕۆژ لە سەرکردایەتی مامەوە زۆر سودم وەرگرت شارەزای سیاسەتی ی. ن. ك بووم، بەرای خۆم لە رووی هوشیاری سیاسی بەرەو پێش چووم، ئاشنایەتیەکی چاکم لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتی پەیدا کردو ئاڵوگۆڕی زۆری بیروباوەڕمان کرد لەسەر مەسەڵە جیاجیاکان، لەو ماوەیەدا هەر لەبارەگای کاك نەوشیروان بووم.

کاك نەوشیروان وەکو ئێمە هیچ شتێکی لە ئێمە پتر نەبوو، هەر خەریکی نووسینو خوێندنەوە بوو پیاوێکی نووسەرو کوردی زانێکی زۆر باشە، ئەگەر لای دانیشی قسەنەکات ڕقت لێی دەبێتەوە، کە دەستیش دەکا بە قسەکردن خۆشەویست دەبێ، دوور بینەو هەمیشە پێش بینی لە ڕووداوەکان دەکا قسەی حەقو ڕەقە هەرچی قسەیەکی هەبێ بەرەو ڕوو دەیکات، بەئاستەنگ دۆستایەتی دەکات، وە بەئاستەنگ دۆستایەتی هەڵدەوەشێنێتەوە لەپێش حەفتاکان سەرپەرشتی گۆڤاری ڕزگاری کردوە، زۆربەی بڵاوکراوەکان ی.ن.ك و کۆمەڵە، کە بە کوردی بڵاوکراونەتەوە نوسینی ئەوە، زۆربەی هەرە زۆری ناوچەی کوردستان بە پێشمەرگایەتی گەڕایەوە، لەناخی پ.م دەگا دەزانێ چیان پێویستە، سەرکردایەتی زۆر شەڕو داستانی کردووە سەرکەوتنی مەزنی بۆ ی.ن.ك بەدەست هێناوە، لە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەو ی.ن.ك بووە، جێگری سکرتێری گشتی ی.ن.ك ی لە ئەستۆ بووە، لە ڕۆژانی سەختو دژوار سکرتێری گشتی کۆڕەك بووە.

بۆ پاراستنی گیانی بەڕێز مام جەلال زۆر جار پاسەوانیمان دەگرت، بۆ شوێنێك بچوایە لەگەڵی دەڕۆیشتین مام جەلال پیاوێکی زاناو ڕۆشنبیرو تێکۆشەرێکی گەورەی کوردە، یەکێکە لەناودارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە زانستی مارکسیزم - لینینزم زۆر شارەزایی هەیە، حەز لە

گوشتەوبڕین ناکات، حەز لە شتی یاسایی دەکات، بەرامبەر بە دوژمن زۆر چوستو توندو تۆڵە، تەکتی تەنگانە ورە بەرنادات، بڕوای بە دوارۆژی کورد زۆر زۆر بەهێزە هەر لەویش هەڤاڵن مامۆستا جەعفەرو مامۆستا برایم جەلالو کاک رەسوڵ مامەندو کاک د. مەحمودم ناسی.



## کۆبوونەوەی فراوانی شێنێ

لە بەهاری ١٩٧٨ دا کۆمەڵە کۆبوونەوەیەکی فراوانی بۆ کادرە پێشکەوتووەکانی بەست، کە تێیدا بارو دۆخی ئەوکاتی شۆڕشی هەڵسەنگاند، سەرکردایەتی تازەی بۆ کۆمەڵە هەڵبژاردەوە، داڕشتنی پلانی تازەو تاوتوێ کردنی ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر کوردستاندا هاتووە، لێکۆڵینەوە لە باری پ.م، باری ڕێکخستنی ستراتیژو تەکتیکی کۆمەڵە، پەیوەندیمان لەگەڵ (حشع). پەیوەندیمان لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران، عێراق، تورکیا، سوریاو لەگەڵ بەرهەڵست کارانی عێراقی، هاوکاریو گیوگرفتەکانمان.. لەگەڵ بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان پەیوەندی لەناو ی.ن.ك باری نێو دەوڵەتی، سۆڤیەتو مەسەلەی سۆسیالیستی بەرنامەی کۆمەڵە، داواکانمان: ئۆتۆنۆمی - مافی چارەی خۆنووسینو گەلێ باسو لێکۆڵینەوەی تر هاتە پێشەوە، ئەو کادرو سەرکردانەی بەشداریان تێداکرد (٢٦) کادرو سەرکردە بوون ئەمەش ناوی بەشدا بووەکانە :

١. نەوشیروان مستەفا.
٢. مەلا بەختیار.
٣. مولازم عومەر.
٤. برایم جەلال.
٥. مامۆستا جەعفەر.
٦. شەهید سەید کەریم.
٧. ئەبو شەهاب.
٨. دلێری سەید مەجید.
٩. زیرۆ ئەحمەد.
١٠. خەلیل جەلال.
١١. هاوار جەلال.
١٢. نەریمان.
١٣. مامۆستا ڕەشاد.
١٤. ڕێباز.
١٥. سەرکەوت.

٣٦- سەلام.

٣٧- حەمە سەعید.

٣٨- شەهید عەلی ئامە خان.

٣٩- سەیفەددین هاواری.

٤٠- سەیوان.

٤١- شێخ تاڵب.

٤٢- سالار (لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا هاتو بەشداری کرد لە سوریا گەڕایەوە).

بەداخەوە ناوی هەڤاڵنی ترم لەبیر نەماوە.

لە گەرمەی کۆبوونەوەکان بووین.. دوژمن هێرشی کردە سەرمان، چەند ڕۆژێك کۆبوونەوەکە دواخرا.. هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال لە چەندین کۆبوونەوە بەشداری تیادا کرد، باسی هەل و مەرجی لە دایك بوونی کۆمەڵەی کرد، هەڤاڵن د. مەحمود عوسمان سکرتێری پدك لیژنەی ئامادەکاریو هەڤاڵ رەسوڵ مامەند لەجیاتی (بسك) مامۆستا برایمو د. جەعفەر بەناوی کۆمەڵەی ئێران ـ تێڕوانینی خۆیان دەربڕی لەسەر شۆڕشو کێشە ڕەواکەی، لەوێ کوردستانیەتی کۆمەڵە.. سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوە بڕوامان وابوو ئەو سنوورەی کوردستان دەستکردە پۆلیسو ژەندرمەو قەرەقوڵ ناتوانن ئەو سنوورە بەسەر کوردستان بچەسپێنن.. بەڵکو هەموو سوپای ئەو دەوڵەتانەش ئەو توانایەیان نیە.. لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاری گەلێك گرنگ دران، لەو هەل و مەرجو شکستەی ه.پ.ك لە بادینان.

دیاری کردنی فەرماندەی ئازاو لێوەشاوەو بەبیروباوەڕ بۆ هەرێمەکان هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی، پێداگرتن لەسەر ڕۆڵی کۆمەڵە لەناو ی.ن.ك دا هاوکاری لەگەڵ بزووتنەوە، کە لە سەنگەری ی.ن.ك دان برایەتی لەگەڵ لیژنەی ئامادەکاری، هاوپەیمانیەتی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران بەتایبەتی کۆمەڵە.

گرنگترین بڕیاری کۆبوونەوە: لابردنی ئۆتۆنۆمیو داواکردنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کوردمان، لە کۆبوونەوەکە ئەو باوەڕە دروستبوو کە چیتر هێرش نەکەینە سەر سۆڤیەت.. بەڵکو لەمەو دوا ئەگەر هەڵەیەك ڕوویدا.. هەر باسی ئەو هەڵەیە بکەین.. کە پێشتر کۆمەڵە سۆڤیەتییەکانی بەلادەر دەزانی وە لە ڕاستیشدا لادەر دەرچوون..، گەلێ گلەییو گازندە ڕووبەڕووی هەندێ لە هاوڕێیان بوەوە.. بەڵام بەگیانی هاوڕێیانە هەموویان چارەسەر کران.

**سەرکردایەتی تازە لەم بەڕێزانەی لای خوارەوە هەڵبژێردرایەوە :**

١. نەوشیروان مستەفا.

٢. مەلا بەختیار.

٣. سالار.

٤. مولازم عومەر.

٥. شەهید سەید کەریم.

٦. برایم جەلال.

٧. ئەبو شەهاب.

٨. مامۆستا جەعفەر.

٩. بەکری حاجی سەفەر.

١٠. زیرۆ ئەحمەد.

* کاک نەوشیروان مستەفا بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێردرایەوە.

پاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە هەر تێکۆشەرێك گەڕایەوە شوێنی دیاریکراوی خۆی.

کۆبوونەوەی شێنێ یەکێکە لەو کۆبونەوانەی، کە ڕۆڵی گرنگی گێڕا لە گەشەکردنی کۆمەڵە.. لەو ڕۆژەوە بە ئاشکرا بەرچاو کەوت،هەرچەندە کۆبوونەوەی فراوانی شێنێ لە هەل و مەرجێکی دژوار بەستراوە لە ناوەڕاستی کۆبوونەوەکان دوژمن هێرشی هێنا.. بەڵام توانرا بە تێرۆ تەسەلی لە هەموو لایەنەکانی ژیانی شۆڕش و کۆمەڵەو ی.ن.ك بکۆڵرێتەوەو بڕیاری گونجاوی لێبدرێت.

# بزووتنەوە پاش هەکاری

کارەساتی هەکاری زەبرێکی کوشندەی لە شۆڕش‌و ی.ن.ك و کۆمەڵەو بزووتنەوەو گەلەکەمان وەشاند، گرتن‌و شەهید بوونی چەندین سەرکردەو فەرماندەی هـ.پ.ك لەو هەل‌و مەرجە ناسکەدا کارێکی وا ئاسان نەبوو، دەتوانم بڵێم: کارەساتی هەکاری بۆ چەندین ساڵ.. پاشەکشەی بە شۆڕش‌و کێشەی گەلەکەمان کرد، جگە لە زەبردان لە شۆڕشی ی. ن. ك.. ئەو کارەساتە زەبرێکی گەورەی بە هێزی لە یەکگرتنی نەتەوەی کوردو هێزە سیاسیەکانی وەشاند.. کە بۆ چەندین ساڵ ئەو برینە قووڵە سارێژ نەدەبۆوە.

هەر چەند زوو ی.ن.ك توانی تا ڕادەیەك ئەو کەلێنە تەسك تر بکاتەوەو بەرە بەرە پڕیشی بکاتەوە.. بەڵام بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان کە لە بنچینەدا هەڤاڵەکانیان بیروڕای جیاجیایان هەبووْ زەبری (هەکاری) ناکۆکیەکانی قووڵتر دەکردو ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو لاوازی‌و لێکدابڕان‌و داچۆڕانی دەبرد، لەجیاتی ئەوەی هەڤاڵنی بزووتنەوە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو گرێ کۆنانە بدەن، کە پێشتر هەیان بوو.. دەیانویست نوچدانی شۆڕش بقۆزنەوە لەو هەلە کەڵك وەربگرن باڵێك بەسەر باڵەکەی تر زاڵ بێت‌و بیروڕاو سیاسەتەکانی بسەپێنێ.

کارەساتی هەکاری کاریگەرترین زەبری لە بزووتنەوە وەشاند لەبەر ئەوەی سەرکردە مێژووییەکانی بزووتنەوە کاك عەلی عەسکەری‌و د. خالد شەهید کران‌و هەڤاڵ تایەر عەلی والی‌و کاك سەید کاکە، کە دوو فەرماندەی بەناوبانگی هێزی پێشمەرگە بوون بەدیل گیرابوون، هەڤاڵ ڕەسوڵ مامەند.. هەموو کاروباری بزووتنەوەی لە ئەستۆ گرت لەو بارو دۆخ‌و کاتەدا ڕۆژ بەڕۆژ بزووتنەوە بەرەو لاوازی‌و نابووتی دەڕۆیشت.

هەڤاڵنی لێپرسراو لە بزووتنەوە لەگەڵ سەرکردایەتی ی. ن. ك زۆر ناتەبا بوون، هەر چەندە نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین، کە هەندێ لە هەڤاڵنی سەرکردایەتی ی.ن.ك وەکو پێویست ڕێزیان لە بیروڕاکانی بزووتنەوە نەدەگرت بەو واتایە هەردوو لا کەوتنە هەوای سەرو سواری کەلی شەیتان ببوون.

هەڤاڵ ڕەسوڵ مامەندو قادر عەزیزو مەلا ناسیح‌و حاجی حاجی برایم، ئەحمەد فەقێ ڕەش، سەید سەلیم.. هتد، کاروباری بزووتنەوەیان جێبەجێ دەکرد.

ئەگەر لە بەهاری ١٩٧٨دا بزووتنەوە لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەوری سەرەکی دەگێڕا.. ئەوە بێگومان لە پاییزی ١٩٧٨ کۆمەڵە ڕۆڵی سەرەکی لەناو ی.ن.ك گێڕا.

ئەو ناكۆكیانە لەجیاتی ئەوەی ڕۆژ بەڕۆژ كەمترو خەفەتر بێت.. بەپێچەوانەوە زیاتر دەبوو، هێشتا ئاگری ناخۆشییەكانی خۆشتر دەبوو. گەلێك ڕووداوی سەیرو سەمەرەم دینی زۆر گرنگەی ناشۆڕشگێڕانەم دەبینی، كە جێگای ئەوە نییە باسیان بكەم.

تا ئەو رادەیەی كاك رەسوڵ مامەند وای لێهاتبوو لە كۆبوونەوەكانی م- س ی.ن.ك بەشداری نەدەكرد.

بەڕێز مام جەلال زۆر ڕێزی كاك قادر عەزیزی دەگرت.. هەم لەبەر ئەوەی لاوێكی تازە پێگەیشتوو بوو، هەم برازای شەهیدی نەمر سەعدی گچكە بوو، هەموو بیرو راكانی بزووتنەوە لە م-س رادەگەیاند.

هەر چەندە ئەو ناكۆكیانە لەسەرەتا لە سەركردایەتییەوە دەستی پێكرد بەرە بەرە هەرێمو كەرتو مەفرەزەو كادرو رێكخستنەكانیشی گرتەوە، لە ئەنجامدا بووە هۆی ناكۆكیەكی پانو بەرین، تا رادەی لێك ترازانو لێك جیابوونەوە، كە لە باسەكانی داهاتوودا.. دێمە سەری.

لەو سەرو بەندانەدا بوو شۆڕشی گەلانی ئێران ڕۆژ بەڕۆژ فراوانتر دەبوو، خۆپیشاندان.. لە شارەكانی ئێران پەرەی سەند، ڕژێمی شا كە گفتی بە عێراقدا بوو.. دەیانویست ئەمجارەش جیەكەوە كورد داخ بكەن، لەبەر بێ سەرو بەری نەدەپرژانە سەر شۆڕشی كورد، هەر چەندە لە شەری شێنێ.. هاوكاری ڕژێمی عێراقی زۆركرد، بەڵام كاری سەرەكی ڕژێمی شا ئەو كات سەركوت كردنی گەلانی ئێران بوو.

شۆڕشی ئێران بەرەو پێش دەچوو، كورسی حەمە رەزا شای پەهلەوی شلۆقتر دەبوو، ڕژێمی عێراق مەزندەی گەورەتری بۆخۆیی‌و شۆڕشی كورد دەكرد، چونكە سەدامو ئەحمەد حەسەن تەلیەكر.. دەیانویست شا وەكو خۆی بمینێ‌و هاوكاری یەكتر بكەن.. لەلێدانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی كورد.

شۆڕشی كوردو ی.ن.ك بەگوێرەی ئەو توانایەی، كە ئەو كات لەبەر دەستی دابوو، یارمەتی زۆری گەلانی ئێران بە گشتی‌و گەلی كوردمان بە تایبەتی دا ئەوانەی كە لەلایەن ڕژێمی شا فەرمانی گرتنیان دەرچوو دەیان توانی بێنە بارەگای ی.ن.ك، كە لە (خڕی ناوزەنگ‌و زەڵێ) بوو لەسەر سنووری عێراق - ئێران.

بە هەموو توانایەك یارمەتی كۆمەڵەی ئاستەنگكێشانی كوردستانی ئێرانی دا تا بتوانێ ڕێكخستنەكانی هان بداو یارمەتی هەڤاڵنی حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێرانیشی دا بۆ ئەو مەبەستە.

## داستانی شێنێ

لەبەر ساردی لە ١٩٧٨/١٠/٢٠ دا بارەگامان لە دەراوی گوێز گواستنەوە بۆ خڕی ناوزەنگو زەڵێ، کە دەکەوێتە سەر سنووری عێراقو ئێران.. یەك جۆگەلە ئاوی بچووك خاکی کوردستان دەکاتە دوو بەش یەکێکیان عێراق بەخۆیەوە لکاندووەو ئەوی تریان ئێران.

زۆر جار قاچەکانم لەم بەرو لەوبەر دائەگیناو دەموت: لە هەردوو کوردستانم . شێنێ تەنیا گوندێك بوو لەسەر سنوور دوژمن دەستی پێ ڕانەگەیشتبوو وەکو خۆی مابوو، دوژمن زۆر ناڕەحەت بوو، کە چۆن دەبێ شتێك لەبەردەم حکومەت ئاستەنگ بێت .

لەگەرمەی کۆبوونەوەکانی شێنێ بووین، لە کۆنە مزگەوتەکەی باسی بارودۆخی سێ ملیۆن کورد دەکرا، لەو گوندە تێکۆشەرە پلانو نەخشەی شۆڕش ڕێك دەخرا، لەو لادێیە دوورە، کە خەڵکەکەی بەمەڕو ماڵاتو ڕەزوباخو قاچاخچییەتی ژیانیان بەڕێوە دەبرد، چەندین سەرکردەو کادری کوردستان کۆبوونەوە، لە پەنا شاخی مامەندە ئەو گوندە خۆی ڕزگار کردبوو لەبەر ڕاگوێزانو گواستنەوە.. ئێمەش لەناو ئەو گوندە چاومان بڕیبوە هەر چوار پارچەکەی نیشتمانی خۆمان.

شێنێ بنکەی سووری شۆڕشگێڕان بوو بووە چقڵی چاوی ئەو دوژمنە سەر سەختو لەخۆباییە، هەڤاڵن هەر کەسە بۆچوونی خۆی دەدایە بەڕێز مام جەلال.. ئەوشەوە باسی چۆنیەتی لەدایك بوونی کۆمەڵەی بۆ دەکردین.. هەمووومان بەوردی هەستمان ڕاگرتبوو شەو بوو.. نەمان دەزانی دوژمن پیلان دەگێڕێ، نەماندەزانی لە بنکەو تەویلەکانی ڕژێم سەری تێکۆشەران سەودا دەکرێ، هەر بەو شەوە بەرایی سەربازەکانی بەعس گەیشتبوە (سەید ئەحمەدان) تاریکایی باڵی بەسەر دۆڵی مەنگوڕانو هەڵشۆو هێرۆی ڕاگوێزراو ڕاکێشابوو،لەپەنا تاریکایی سەربازەکانیان بە هەورازی سەختو پڕ لە هەڵدێرو هەڵەموندی مامەندە هەڵدەگەڕان تا بە دزییەوە پشتمان لێبگرنو ئەو ترۆسکەیەی کە ماوە لە کورد بیکوژێننەوەو خۆیان بینە سەرتۆپ لە کوردستان.

شەوبوو.. ئێمە لە خەیاڵێك و دوژمنانیش لە خەیاڵێکی تر..! چەند ڕۆژبوو دوژمن خۆی کۆکردبۆوە لەگەڵ ئێران، ڕاوێژی خۆیان کردبوو. شەوی ٨-٩ /١١/١٩٧٨ تامو چێژێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی شۆڕشی کوردستان چونکە لەو شەوەدا دوا پیلانی دوژمنان یەکخراو نابوت کرایەوە لەمێژ نەبوو نۆچدانی بەهارمان بەسەردا ڕۆیشتبوو.. لەبیری چارەیەك بووین، کە خۆمان گورج بکەینەوەو ئەوەی دۆڕاندوومانە بیسێنینەوە..!

کاتژمێر (٩)ی شەو کاک حاجی حاجی برایم بە نامەیەکەوە هاتە ژوورەوە، مام جەلال نامەکەی خوێندەوە، خۆی پێڕانەگیراو وتی: کاکە دەڵێن دوژمن هێزی زۆری هێناوە بۆ سەید صادق.. دەستبەجێ.. مشوور خورا.. کە چۆن شەڕ بکەین.. هەموو شتێك باسکرا تەنیا شەڕنەکردن نەبێ.. هەر زوو مام جەلال داوای کرد، کە (کادیرو چادرەکان) بگوێزرێنەوە شوێنێکی توندو تۆڵتر، لەوەوە دەردەکەوێ مام جەلال چەند پەرۆشی کادرەکان بوو.. چونکە دەیزانی لە دەستدانی ئەو کادرانە ئەم جارە شۆڕش زۆر ساڵی تری دەوێ تا دێتەوە سەرپێی خۆی.

پەرەی شەڕ دابەشکرا، هەموو کادران گەڕانەوە خڕی ناوزەنگ کاک مەلا بەختیار داوای لەمن کرد لەلای ئەوان بم، ئەرۆیشتمەوە لەشێنێ بووم، دەوروبەری شێنێ بە هەرێمی باڵەك سپێردرا تەگەڵ کاک مەلا بەختیار.

کاتژمێر بۆ بەیەکی پاش نیوەشەو لەسەر ترۆپکی هەرە بەرزی مامەندە.. بوو بە تەقەو هاژە، ئەو لوتکە دەڕوانیتە سەر هەموو بارەگاکانی یەکێتیو بەتەواوی کۆنترۆڵی سەرکردایەتی دەکرد.

لەپاش شەڕێکی نێو کاتژمێری.. دوژمن گرتی. بەیانی زوو ئێمەش شوێنی خۆمان گرت، گەواڵە هەور لە سەرمان نەمان دەزانی پاڵ پشتی کامەمان دەکات - وێڕای ئەوەش زریان دەستی پێکرد، چرقەی ددانمان دەهات لە سەرمان! ڕێژنەی باران تێکەڵ بە گوللەی دوژمن بو بەسەرماندا دەباری..! دوا کات بوو بە بەفر کەژو کێو وەکو تارای بووك سپی هەڵگەڕا تەقە لە هەموو لایەك گەرم بوو.. لاوکی شاخۆرانی لێ دەوەشایەوە.

لەبەر نەداری جلو پۆشاکی زستانمان تەواو نەبوو، لە ڕۆژهەڵاتی شێنێ شەڕ گەرمتر بوو سێ شەهیدی سەنگەر پەرست، هەڵۆی کوێستانان ئەحمەد مەولود فەرماندەی کەرتی هەرێمی باڵەك سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد..

کات دەمەو ئێوارە بوو، کاک مەلا بەختیار فەرمانیدا، کە ئێمەش بچینە لای کاک ئەحمەد مەولود.. کە چووین لەسەر حاڵی خۆمان زۆر بەزەییمان بەو پێشمەرگانەش دەهاتەوە.. کە تەگەڵمان بوون، هەڵدەپەڕین لەناو بەفر، شوێنی وشکمان دەدان بوو، لە هەموو لایەکیش بە چەکی قورسو سووك گوللە باران بوو، کە کاک مەلا بەختیار باری ئەوانی چاو پێکەوت وتی هەستن بگەڕێنەوە ئەو شەڕە بەو شێوەیە ناکرێت ئا لەوێ باشترین پێشمەرگەی دڵسۆزم بینی، ئەویش شەهید ئەحمەد مەولود بوو وتی: ڕاستە جەنابت ئەندامی سەرکردایەتیت ، بەڵام فەرماندەی هەرێمی ئێمە کاك زیرۆ ئەحمەد ڕێوییە تاکو ئەو فەرمانم پێ نەکات ناگەڕێمەوە..

ئەگەر هەر هەمووشمان لە سەرماندا ڕەق بینەوە ، کاک بەختیار وتی: دەباشە با هێرشێک بکەین.. هەموومان هێرشمان کرد.. دوژمن بەو هەموو توانایەی کە هەیبوو.. شکاو دوو لاشەی سەربازی لە دوای بەجێماو دوو کلاشینکۆفمان دەست کەوتبوو، توانیمان ئەو ڕۆژە مەترسی دوژمن لە خۆمان دوور بخەینەوە.. هەموومان هاتینەوە گوندی شێنێ.

دوژمن، کە پشت دەدات دەشکێ.. دەیەوێ ڕق و تووڕەیی خۆی بە هەژارانی کورد بڕێژێ، گوندی پاک و دلگیری شێنێی دایە بەر تۆپی قورس بەچاوی خۆم دیم چەند پارچەیەک بەر پیرەژنێکی پەنجا ساڵە کەوت! زۆر یارمەتیمدا لەگەڵ هەڤاڵەکانی خۆمان.

شەو هاتەوە، قەڵای مێردانە شەوی تاریک.. خۆمان لە دوژمن لە کەمین دانا، بەڵام ئەوان هەر ئەو کەسەن کە لە ڕۆژی ڕووناکدا دەتوانن خۆیان هەڵکێشن، بەیانی لەگەڵ گزنگ هاتنەوە.. ئەوجارە لەگەڵ دەیان کۆپتەر.. دیسان شکانەوە ڕۆژی دواتر ئێمە گەڕاینەوە خڕی ناوزەنگ ئەرکی خۆمان بەچاکی جێبەجێ کرد. چاک خۆمان بۆ شەڕ ئامادە نەکردبوو، فیشەکمان کەم بوو، خواردن و ئازوقە بەشی دوو سێ ڕۆژی دەکرد. ئێوارەیەک بەدوایاندا ناردم و ڕەوانە کرام.. بە فەرماندەی کاک عەلی ئامە خان و مامۆستا برایم ئەندامی سەرکردایەتی چەند پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەی ئێرانمان بردە قووڵایی ناوچەی سەردەشتی ئێران، لە گوندێکی نزیک سەردەشت ئێمە گەڕاینەوە، مامۆستا برایم لەوێ مایەوە.. نازانم بۆ کوێ ڕۆیشت !

بەیانی زوو گەیشتینەوە خڕی ناوزەنگ مام جەلال لەگەڵ د. مەحموودو شەهید وەسمان ڕاوەستابوون، کە چاویان بە ئێمە کەوت.. وتیان: چیتان کرد.. وتمان بەڵێ، مام جەلال وتی: وەرن لە چادرەکەی من پشوو بدەن، لەو کەین و بەینە دوو کۆپتەری شەڕو چوار کۆپتەری بارهەڵگر هاتنە سەرمان.. ڕاستەوخۆ دەستیان بەتەقەکردو گوللەیەک بە چادرە کەوت مامۆستا ڕەشاد ئاوڕی لە مام جەلال دایەوەو وتی: باشە مامە ئێرە نەوتی کەرکوکە بۆ نەڕۆین..؟ مام جەلال تووڕە بوو وتی: دەبێت ئێرە قەبری هەموومان بێت ، بچینە هەر شوێنێک دوژمن دێتە دوامان لێرە بمرین باشترە.

بەڕاستی ئەو هەڵوێستەی مام جەلال، منی سەر لەنوێ بووژاندەوە، کە بینیم گەورەترین سەرکردەمان لەتەنیشت ئێمەوەیە هیچ قسەیەک نامێنێ.

دوو ڕۆژ دواتر زۆر کەل و پەلمان بۆ هات لە دیوی ئێران لەخەلکی جوتیارو گوندنشین.. تومەز مامۆستا برایم چووبوو کۆمەکمان بۆ بێنێ، خەڵکی بەشەرەفی کوردستانی ئێران هەرچی لەتوانایان بوو بۆ ئێمەیان کرد، جوتیارێک لەگەڵ یەک جاجم (بەرماڵ)ێک یەک نامەی بۆ مام

جلال نووسی بوو، که دەڵێت: مامە گیان بە کوردستان لەوەندە زیاتر ئیقتیدارم نییە..! ئەگینا پۆحیشم بۆ کوردستان لەچاو نییە خوا بتانپارێزی، سەری ئێمەشتان لە ئێران بەرز کردەوە).

ئەگەر بە چاوی ویژدان سەیری نامەی ئەو جوتیارە کوردەی ئێران بکەین ئینجا دەزانی.. خەلکی کوردستان چەند پێشمەرگەی ڕەسەنیان خۆش دەوێ.

بەڵێ نۆ ڕۆژو نۆ شەو بەو شێوەیە شەڕمان لەگەڵ دوژمن کرد، ئێرانیش لە سنووری خۆی پێشمەرگەو ئەرتەشی بە کۆپتەر دابەزاند، ڕێگای بە ژن و منداڵی بچووکیش نەدا بە پەنا هەنێدە، یان بۆ چەند ڕۆژێك بچنە گوندەکان تا لە کوشتنی منداڵەکانیان دڵنیا بن.

بەچاوی خۆم دەم بینی کۆپتەرەکانی عێراق لەسەر خاکی ئێران دەسووڕانەوە جارجار دەچوونە سەردەشت..! بە بۆچوونی من ئەڵقەیەکی تر بوو.. لەو زنجیرە پیلانە گلاوانەی دوژمنانی کورد، کە بۆ تێکدانی شۆڕشی کوردیان سازدەدا.

دوژمن بە دەیان سەربازی لێکوژراو دەیان سەربازی بە هۆی بەفر بارین ڕەق بوونەوە تاکو بەهاری داهات و لەژێر بەفر بوون، چەندین چەك و هاوەنمان دەستکەوت لە ئێمەش لەو شەڕە تەنیا دوو پێشمەرگەی قارەمان لەو شەڕە دوور و درێژە بریندار بوون، کە یەکێکیان بەناوی (زەردە) خەلکی قورشاغ لوی دەشتی هەولێر بوو.

لەو شەڕە کەم وێنەو داستانە مەزنەدا دوژمنانی کورد شکان و شۆڕش سەرکەوت و ڕەگو ڕیشەی بە یەکجاری داکوتا.

شەڕکردن هەمیشە دوو لایەنەیە، ئەگەر سەرکەوتی، دوژمن دەشکێ و جەماوەری زیاتر بۆ شۆڕش پەیدا دەکەی.. ئەگەر شکست بێنیت.. ئەوا نوچدانێکی گەورەیە هەم لەڕووی مەعنەوی و هەم لەڕووی جەماوەرییەوە.

داستانی شێنێ یەکێکە لە سەروەرییەکانی مەزنی شکۆداری شۆڕشی کوردستان و ی.ن.ك و هەیەك.

شۆڕش کردن کارێکی سەختە، ماندووبوون و ڕەنجە، بەبۆچوونی من ئازایەتی هەمیشە شۆڕش بەرەو پێش دەبات.. بۆیە دەبێ پێشمەرگەکان هەر ئازابن هەتا سەرکەوتنی گەورە بەدەست دەهێنن.

سلاو لەو تێکۆشەرانەی بەشدارییان کرد لە شەڕی مان و نەمانی شێنێ، بەخێر بێت یادی شەهیدان سەید کەریم و ئەحمەد مەولودو محەمەد خالدو سەرجەم ئەو قارەمانە گیان لەسەر دەستانەی لەو شەڕەدا دەوری کاریگەریان هەبوو.

شەڕی شێنێ پێویستی بە خوێندنەوەیەکی قووڵ هەیە چونکە لەهەڵو مەرجێکی گرنگ ئەو شەڕە ڕوویدا، چونکە دوژمن لەو شەڕەدا زیاتر لە سێ سەد هەزار سەربازو زیاتر لەسێ هەزار دەبابەو سەدان فڕۆکەی جەنگی کۆپتەرو بەهەزاران جاشی چڵکاو خۆرو کاسەلێسو نیشتمان فرۆشی بەکار هێنا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەو کاتەدا لە (٦٠٠ بۆ ٧٠٠) پ‌م تێنەدەپەڕی ،چەندین پێشمەرگەش گەڕابوونەوە لە ئەنجامی ناکۆکێ ناو هێزە سیاسییەکانی کوردستان.

هەموو ئەو شوێنەی شەڕمان تێدا کرد لە (٥ تا ٨) کم پتر نەدەبوو، یەکەمینجار بوو پاش نسکۆ ه‌.پ‌.ك لە شوێنێکی واسەختدا نۆ ڕۆژو نۆ شەو ڕوو بەڕوو بەرامبەر ئەو دوژمنە بەهێزە شەڕ بکات ، سەرەڕای ئەمانەش زیانی دوژمن زۆر زۆر بوو، خەڵکی گوندی شێنێ زۆربەیان خۆیان چەکدار کرد بە دەستکەوتەکان، قوربانیمان نەبوو تەنیا دوو پێشمەرگە بە سووکی بریندار بوون.

ئەو شەڕە یەك ڕاستی گەلێ گرنگی یەکلاکردەوە.. ئەویش: ئێرانو عێراق هاوکاری تەواوی یەکتریان کرد بۆ ئەوەی ئابڵۆقەمان بدەن، بەڵام ئازایەتی پێشمەرگەکان، ئەو پیلانەیان تێك شکاند.

ئەوە دەسەلمێنێ.. با هەموو دوژمنان یەك بگرن گەر خۆمان هەبین دوژمن ناتوانێ لەخاکی خۆمان شەڕمان لەگەڵ بکاتوەمان شکێنێ، ئەو کات پێشمەرگەی کوردستان دەیزانی.. خەباتو تێکۆشان پێویستی بە قوربانیدانەو شۆڕشیش گیان بەخشینە.

شۆڕش کردن هاتنە سەر حازری نییە، خۆ هەڵکێشان نییە بەڵکو کردەوەی ڕۆژانەیە، گیان بەختکردنە، شۆڕش کردن خزمەتکردنی گەلە، بە ئارەقو خوێن دەبێ ئامادەبێ.

داخەکەم هەموو ئەو واتایە لەبیرکراو.. هەلپەرستان بە ئارەزووی خۆیان شۆڕش پێناسە دەکەن.. کە پێم وایە بە هەڵەی گەورەدا دەچن.

**شەهید ئەحمەد مەولود**

**هەلۆی کوێستان**

لە شۆڕشی ئەیلولدا کاریگەرانە بەشداری کردووە، خەڵکی دۆڵی باڵەیانی ناوچەی قەسرو ماکۆسە، لە سەرەتای شۆڕشی نوێ هاتۆتە ریزی شۆڕش و بووە بە ئەندامی بزووتنەوەو پاشان یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان، بە پلەی جیاجیا لەریزی هێزی پێشمەرگەدا کاری کردووە لە هەستانی شێنێ لە ١٩٧٨ فەرماندەی کەرتی هەرێمی باڵەک بوو مەردانە بەرگری لە سەرکردایەتی ی.ن.ك کرد. پاشان کرا بە فەرماندەی تیپی ٧٨ ی کارۆخ لە دەیان شەڕو پێکدادان بەشداری کردووە، لە بنەماڵەکەیان چەندین شەهید هەیە.

لە شەڕی قەندیلی دووەم لە ١٩٨٣/٩/١ لەسەر لوتکەی کونە کۆتر شەهید کرا پیاوێکی لەسەر خۆو دووربین و قسەخۆش بوو.

لەگەڵ پێشمەرگەکان خۆی جیا نەدەکردەوە، چەندین کاتژمێرێك پێش شەهید بوونی لەلای ئێمە دانیشتبوو مێژووی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە.



**شەهید**
**ئەحمەد مەولود**
**هەلۆی کوێستان**

## شا بۆی دەرچوو..!

هەموومان دەزانین کوردستانەکەی خۆمان بەسەر چوار دەوڵەتی هاوسێی یەکتردا دابەشکراوە، هیچیان دان بە مافی کورد نانێن.

گۆڕانی بارودۆخ لە هەر دەوڵەتێك.. کە کوردستانی بەسەردا دابەشکراوە، گۆڕان بەسەر بارودۆخی کوردستان دێنێ.. چەند مانگێك پێش شەڕی شێنێ.. عێراق (ئیمام خومەینی) لە وڵاتەکەی دەرکرد.. بۆ ئەوەی شا ڕازی بکات شا با نووێ هاوسەری شای بێ پەیمان بانگ هێشتن کرد، ئیمام خومەینی چوو بۆ کوێت و لەوێش بۆ فەرەنسا لە پاریس نیشتەجێ بوو، ناکۆکی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان.. لەسەر بازاڕی ئێرانی زۆر توندو تیژ بوون هەریەکە دەیویست بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێ و دژی دەوڵەتەکەی تر کاری دەکرد، دەیویست جێبەجێ خۆی توند بکات، شای ئێران، کە ساڵەها بوو بە پشتیوانی ئەمەریکا ببوە پۆلیس.. خلیج لەخۆی بایی ببوو دەیویست لە ئاغاکانی هەڵبگەڕێتەوە.

گەلانی ئێران ـ فارس ـ ئازەر ـ کورد ـ عەرەب ـ تورکمان ـ بلوچ هەریەکە بە شێوەیەك لەلایەن ڕژێمی شا دەچەوسانەوە (ساواکی) ئێرانیش شەڵم کوێرم هیچ نابوێرم.. کەوتبووە گیانی خەڵك، بێ ڕەوشتیان لەناو کۆمەڵانی خەڵك بڵاوکردەوە.

کار گەیشتبووە ئەوەی هیچی بەرگەی نەگرت بۆیە لە ساڵی ١٩٧٨ گەلانی ئێران.. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەڵوێستی مەردانەیان بەرامبەر ڕژێمی شای جەلاد وەرگرت، ڕۆژانە خۆپیشاندان لە شەقامەکانی تاران بەرپا دەکرا، هەرچی هێزو توانای شا هەبوو کەوتە کار.. دامرکاندنەوەی ئەو گیانە شۆڕشگێڕیە کوشتن ـ نان برین، جار جار پاڕانەوە.. بەڵام کار لەکار ترازابوو.. هیچیان دادی نەدان.

ئیمپریالیزمی ئەمەریکیش، کە خاوەنی گەورەترین بەرژەوەندی بوو لەئێران بۆ ئەوەی سۆڤیەتیەکان لە ئێران و ئاوەکانی گەرم وەکو (خلیج و موحیتی هیندی) نزیك نەکەونەوە.. ناوچە نەوتییەکانیان نەکەوێتە دەست، هەرچی هەوڵ و کۆششی لە دەستی هات بەکاری هێنا، بۆ ڕزگارکردنی شای ئێران یان هێنانە سەرکاری حکومەتێکی بەکرێ گیراوی سەر بە ئەمەریکا، یا حکومەتێکی عەسکەری، هیچیان بۆ نەکرا، لافاوی جەماوەری پێ ڕانەگیرا.

تا ئەو ڕۆژەی شای ئێران شای خوێن مژو دزو بێ ئابڕو بەخۆیی و دەست و پێوەندەکانی خاکی ئێرانیان بەجێهێشت، کە ئێستا ئاوارەی هەندەرانن هەر چەندە ئەو بەد ڕەفتارانە، ئەو ویژدان

مردووانه، ئەو جوامێر فرۆشانە لەسەر ماڵی خەڵکی ڕەش و ڕووت بەسەدان ملیارد دۆلاریان هێزیو خۆیان دەوڵەمەند کرد. بەڵام جێگای ئێرە بێ نین.. چونکە لەکەی ئارەقی شەرمەزاریان پێ ئەسڕێتەوە.

بێگومان بارودۆخی ئێران ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر بارودۆخی کورد چونکە بەشێکی گرنگی خاکی کوردستان.. لەلایەن ئێرانەوە داگیرکراوەو دراوسێی عێراقە، کە ئەویش بەشێکی تە خاکی کوردستان داگیر کردووە.

ئەوەندەی ڕاپەڕین و شۆڕشی گەلانی ئێران کاری لەسەر بارودۆخی شۆڕشی ئێمە کرد، هیچ شتێکی تر ئەوەند کاری نەکردۆتە سەر، روخاندنی شای ئێران دوژمنی دێرینی گەلی کوردو دۆستی عێراق و خاوەنی ڕێککەوتن نامەی جەزائیر، جارێکی تر لە ماوەیەکی نزیکدا دۆستێکی تر وەك ئێران بۆ عێراق پەیدا نابێت، شۆڕشی گەلانی ئێران، کە دەستی پێکردو ڕۆژانە کاری یاشی دەکردە سەر سنووری کوردستانی خوارو، بەپێی گەشەکردنی شۆڕشی گەلانی ئێران شۆڕشی ئێمەش دەچووە پێشەوە، ئەوانەی ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لەخۆپیشاندان و هاندانی گەلانی ئێران هەموویان لە ڕووی فکرەوە دژی ڕژێمی عێراق بوون، ئیسلامیەکان، کە زۆربەیان لەلایەن ئیمام خومەینی ڕێبەری دەکران، تازە لە عێراق دەرکرابوون، موجاهیدی خەلق کە ئەوکات خومەینیان بەرێبەر دەزانی لەگەڵ چریکی فیدائی و هێزە سیاسییەکانی کورد.. هەموویان دژی سیاسەتی دکتاتۆریانەی عێراق بوون، هەر بۆیە عێراق زۆر لە نزیکەوە چاودێری گۆڕانکاریەکانی ئێرانی دەکرد.

بڕیاری ئەوەی لە دەستچوو، کە لەماوەیەکی نزیکدا پەیمانێك لەگەڵ ئێران ببەستێ بۆ لێدانی بزووتنەوەی کورد. جگە لەمەش مەترسی ئەوەی دەکرد پریشکی ئەو شۆڕشە بپەڕێتەوە بۆ عێراق.

ئەوەندەی سەری قاڵ بوو بە بارودۆخی ئێران، ئەوەندە ئاگای لە کورد نەمابوو، هەر چەندە هێشتا بەگەرمی حەپەی دەهات، تاکو ڕۆژی ١١/٢/١٩٧٩ شۆڕشی ئێران.. دوا سەرکەوتنی بە دەستهێناو کوردەکانی ڕۆژهەڵاتیش سەریان هەڵدایەوە.

## ڕووداوە گرنگەکانی

## ساڵی ١٩٧٩

شای ئێران.. یەکێکە لە دوژمنە هەرە سەرسەختو گەورەکانی گەلی کوردو بکوژی شەهید قازی محەمەدو هەڤاڵەکانی، بکوژی مەلا ئاوارەو سمایلی شەریف زادەو هەزاران تێکۆشەرانی تری کوردستانی ئێرانی بوو.

لە سەرەتای مانگی شوبات شاە لەژێر لافاوی قینی گەل.. تارانی بەجێهێشتو دەربەدەرکرا. کە شاپوور بەختیار سەرۆك وەزیران بوو، خومەینی لە پاریس گەڕایەوە، هەر چەندە کاربەدەستانی ئێران هەڕەشەیان دەکردو دەیان وت: ناتوانن زامنی ژیانی خومەینی بکەن لەکاتی گەڕانەوە، بەڵام لە فڕۆکەخانە مهر ئابادی تاران یەك ملیۆن پتر لە خەڵکی ئێران پێشوازییان لە خومەینی کردو کۆنەپیاوەکانی شاە هیچیان بۆ نەمایەوە، قەدەغەکردنی هاتووچوویان لەتاران ڕاگەیاند ئیمام خومەینی داوای لە خەڵك کرد، کە ئەو بڕیارەی کاربەدەستانی سەر بە شاهانشا بشکێنن، چاوچنۆكو بەرەڵاکانی سەربە شاە کەوتنە خۆشاردنەوە، هەر چەندە نوێنەرانی ئەمەریکا لە تاران هەوڵاو کۆششیان کرد هیچیان بۆ نەکرا بە ناچاری نوێنەری کۆشکی سپی (البيت الأبيض) ـ نوێنەری کارتر بەپەلە خۆی شاردەوەو بە ئاستەنگ ڕزگاری بوو.

پۆل پۆل سەربازو ئەفسەرەکان بەلای خومەینی شکانەوە تاکو ڕۆژی ١١/ ٢/١٩٧٩ بە یەکجاری ڕژێمی کۆنەپەرستی شاهەنشای دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ حوکمی بەسەر خەڵکی بەشەرەفی ئێران کردو خێروبێری ئەو خەڵکەی لە پێناوی هەوەسو مەرامەکانی تاقمو دەستەکەی خۆیان خەرج دەکرد.

من ئەو ڕۆژە لە گوندی بانی مارانی ناوچەی دەشتی هەولێر بووم.. زۆر دڵخۆشو شادمان بووم.. دیارە هەر گۆڕانێك لە ئێران ببێ.. ڕاستەوخۆ دەورو کاریگەری لەسەر کوردستانو بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد دەبێت، لەبەرئەوەی لەئێراندا زیاتر لە (٦) ملیۆن کەس کورد هەیەو لەگەڵ کوردەکانی بەشی عێراقو بەشی تورکیا هاوسنوورن، چاك بوونی بارودۆخی کوردی ئێران باش بوونی بارودۆخی کوردەکانی بەشی عێراقو تورکیاو شوێنەکانی ترن، چونکە دوژمنانی کورد ئەو پیلانو نەخشەیەی کوردستانیان وا دابەش کردووە، ئەگینا میللەتێکین هەقی ژیانی سەربەخۆمان هەیە.

کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی ئێران‌و حزبە سیاسیەکانیان ڕۆڵی خۆیان گێڕا لە ڕووخاندنی ڕژێمی شاه، لەپاش ڕۆژی ١٩٧٩/٢/١١ زۆربەی ناوچەکانی کوردستان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی خودی کوردەکان.

ڕژێمی شای ئێران.. بۆ ترساندن‌و سەرکوت کردنی گەلەکەمان لە ئێران لە هەموو گوندێك پاسگایەکی (ژەندرمەی ـ حرس حدود) دانابوو جگە لە سەربازو پۆلیس‌و چریك (جاش)و ساواك زیاتر لە دە هەزار ژەندرمەی لە کوردستان جێگیر کردبوو.

لە ڕۆژی ڕووخاندنی تەخت‌و تاجی ئەو زاڵمە، زۆربەی هەرە زۆری ئەو پاسگایانە لەلایەن خەڵکەوە چەك کران. وەکو پیسکەی دوور ئاواییان بسەرهات چەند ڕۆژ پێشتر زوڵم‌و زۆریان لە خەڵك دەکرد، پەلاماری ناموسی کوردیان دەدا، جەردەو ڕێگریان لە کاروانچییەکان دەکرد، ئێفان‌و جنێوی سووکیان بە خەڵك دەدا، ئەمڕۆ وایان بسەرهات مەگەر بابەدەواری شەڕی کردبێت، سەرشۆڕو زەلیل، چاوەڕێ‌و بێ تووك، مل کەچ‌و داماو شەیتان دەستی پاڕانەوەیان بۆ خەڵك بەرز دەکردەوە.

میللەتی ئێمە بە وەفاو بەبەزەییە هەمیشە لە دوژمنەکانیشی خۆشبووە، ئەگەر داوایان کردبێ، بەم جۆرە پیاوەتی‌و چاکەی گەلی کورد جارێکی تریش بەرامبەر (پیرە مەشهەدیەکان) دووبات کرایەوە.

جاری یەکەم.. لە گرانی لەکاتی قات‌وقڕی، کە ئەو عەجەمانە لە برسان دەمردن، بە ڕەوو دەهاتن بۆ کوردستان بەسکی تێرو هەندێ ئازوقەی زیادەوەکوردستانیان بەجێدەهێشت، ئەفەکەم کێ باسی ئەو پیاوەتییەی کوردی کرد..! کە ساڵەکانی چل ڕوویدا..! کوڕو نەوەی ئەو جۆرە پیاوانە لە کوردستان.. چاویان بڕیبوە ناموسی کورد! خەڵکیان تاڵان دەکرد، بەرتیل‌و پێتاکاو لەلای ئەوان.. هەر شتێکی ئاسایی بوو.

تابێ گەلی کورد لە پیاوەتی خۆی پەشیمان بێتەوە.. چونکە ڕاستی هەر سەر دەکەوێ، ئەوانەی زیاتر لە (٣٠) سی ساڵ گەلی کوردیان بە مەڕوماڵات دەزانی لەو کاتە کەوتنە ژێر دەستی جوتیارەکانی کوردستان، نازانم ئەگەر لەولاو لەملا چەند ڕووداوێکی کوشتن‌و لێدان هەبێ بەڵام بەگشتی هەموویان بەڕێزەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان ڕەوانە کرانەوە من نەم بیست هیچ ژەندەرمەیەك کوژرابێت.

سەربازگەکەی مەهاباد، کە بارەگای لیوایەکی لێبوو، هەموویان چەککردن زۆر سەربازگەو پادگاکانی تریش چەك کران.

بەپەلە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کەوتە خۆیی‌و بە زوویی توانی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بخاتە ژێر کۆنترۆلی خۆی، کۆمەڵەی ئاستەنگکێشانی ئێرانیش بەرە بەرە لەشارو لادێکان بنکەو بارەگایان داناو.. پێشمەرگە ناو نووسکران، لە یەکەمین ڕۆژەوە ناکۆکی توندو تیژ لەنێوان کۆمەڵەو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دروست بوو، جێگەی داخە..! گەلی ئێمە بەتایبەتی حزب‌و ڕێکخراوە سیاسیەکانی لە هیچ کاتێک یەکگرتوو نابن، لە ڕۆژانی خۆشی‌و ناخۆشیدا هەر دوژمنایەتی یەکتر دەکەن.

بە پێچەوانەی هەموو شۆڕش‌و حزبەکانی دنیا، لە چین حزبی شیوعی چین لە هەندێ کات‌و دۆخی سەخت پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ (کۆمینتاغ) هەبوو، کە لە چینی بۆرجوازی گەورە پێک هاتبوو، نۆکەرو ئەڵقە لەگوێی بێگانەش بوون، نازانم کوردەکانی خۆمان بۆچی وا سەیری دنیا دەکەن .. هەر کەسەو هەر حزبە دەیەوێ خۆی ڕابەرو سەرۆک بێت، لەبیر خۆی دەباتەوە کە پێشڕەوایەتی دەبێت لەلایەن جەماوەری خەڵکی کوردستانەوە گەواهی بۆ بدرێت، نەک حزب‌و ڕێکخراوەکە خۆی.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران.. سنوورەکانی کوردستانی ئێران بۆ پێشمەرگەکانی کوردستانی عێراق کرایەوە.. ئابلۆقەدان نەما، واتە قووڵایی ستراتیژی بۆ کوردستانی عێراق هەبوو، لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران.. نێوانی عێراق‌و ئێران بە تەواوی شڵەژا، بە تایبەتی وەڵامی بروسکەی خومەینی بۆ ئەحمەد حسەن ئەلبەکر، کە لە کۆتایی نامەی خومەینی دەڵێت:-

(السلام علی من اتبع الهدی) واتە سەلام لەو کەسانەی ڕێگای ڕاست دەگرن، لە سەردەمی ڕابوردوو پێغەمبەر (دخ) بەو شێوەیە وەڵامی کافرەکانی دەدایەوە، عێراقیەکان بەو قسەیە زۆر نیگەران بوون.. کەوتنە پڕوپاگەندە کردن لە ئێزگەو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیان بەراستی دەوڵەتە ئیمپریالیزمییەکانیش کە بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ ئێران تێک چوبوو.. ئاگری نێوان عێراق‌و ئێرانیان خۆشتر دەکرد تا وای لێهات شەڕێکی نا بەرامبەر لە نێوانیاندا بەرپا کراو بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ملیۆن‌و نیوێک مرۆڤ و ماڵ وێرانیش بەسەر عێراق‌و ئێراندا هات ! پاشان دێینەوە سەر ئەو باسە، کە ڕەنگە هەموو عێراقییەک‌و ئێرانییەک لەگەڵ شەڕەکە لە دوورو نزیک ژیابن.

حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەهێزترین حزبی سیاسی بوو، لە کوردستان دەستی بەسەرداگرت، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر نارێک‌و پێک هەڵسوکەوتی دەکرد، جیاوازییەکی گەورەی

بعدی دەکرد لەو شارانەی، کە رژێم دەسەڵاتی بەسەریا دەشکا، قاچاغ چییەتی‌و شتی تـریش زۆر بە ئاشکرا لە پەنا دەفتەری سیاسی حزب دەکرا.

گەلی ئێمە وا بۆی رەخساوە، هەر کاتێك نیمچە ئازادییەکی هەبوو بە هـەلی دەزانـێ هەرچـی خۆی پێی خۆش بێت بیکات لێپرسراویش هەبوو بەلاّم بەهیچ شێوەیەکی گـوێی بـە رێـك‌وپێکی تەدا، گرانی‌و بێ سەروبەریی‌و قاچاغچییەتی، پیاو کوشتن، شەروهەللا، زوڵم لێکردن لە هەندێ لە پێشمەرگەو لە لێپرسراوەکان لە خەڵکی بـێ دەسـەلاّت‌و هـەژار، کـەببوە خاڵـە گرنگـەکانی لاوازی حدك لە ئێران.

لە کاتێك دەبوایە حزب‌و کۆمەڵە ئەو هەلە بقۆزنەوە هەر چی زووە خۆیان رێکبخەن، جەماوەر بەتە جۆش‌و خرۆش بۆ بەر پەرچـدانەوەی هێرشـی چـاوەڕوان کـراوی دوژمـن، لـە رۆژی نـەورۆزی ۱۹۷۹ (بسـك) لـەناو یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان چـوونە دەرەوە لەگـەڵ (پـدکع) (لیژنـەی تەحزیری ـ د. مەحموود) بەشەو لە ئاوی زەڵێ پەڕینەوە بۆ گوندی گۆڕەشێر لە کوردستانی ئێران بەبێ ئەوەی بە فەرمی ئاگاداری سەرکردایەتی ی.ن.ك بکەن، زۆر هۆی ڕاستەوخۆو نـا ڕاسـتەوخۆ بووە هۆی دەرچوونی بزووتنەوە لەناو ی.ن.ك دا.

# حزبی شیوعی عێراقی و شۆڕش

حشع له ساڵی ١٩٧٣ لەگەڵ حزبی بەعس لەناو بەرەیەکی داتاشراو بەیەکەوە کاریان دەکرد شیوعیەکان پێیان وابوو بەعسییەکان بەرەو سۆسیالیستی دەڕۆن ڕەنگە لەدوا جاریش ببن بە شیوعی، دیارە لێپرسراوەکانیان مێژووی بەعس‌و بیرو باوەڕەکانیان شارەزا نەبوون ئەگینا، کێ هەیە لە دنیادا نەزانێ حزبی بەعس حزبێکی قەومی شۆڤێنییەو دژی بیروباوەڕی پێشکەوتن خوازانەیەو دەیەوێ ئەو گەلانە بتوێنێتەوە، کە لە وڵاتی عەرەبیدا دەژین.

میشێل عەفلەق هەر دژی شیوعیەت حزبی بەعسی دروستکرد، شیوعیەکان ئەو دەهۆڵەی بۆ بەعسیەکانیان دەکوتا بۆ خۆشیان نەدەکرد، دیارە بەعسیەکانیش هەندێ جلەویان بۆ شیوعیەکان شل کردبوو، چونکە لەو بارو دۆخەدا لەو پەڕی بەهێزی دابوو.. بەعسییەکان بۆ ئەوەی گەلی کوردو پارتی لە هەموو هێزە پێشکەوتن خوازەکان دابڕن، لەگەڵ شیوعیەکان یەکیان گرتبوو، شیوعیەکانیش زۆر بێ ئەمەك دەرچوون هەر لە سایەی شۆڕشی ئەیلول گیانی هەزاران ئەندامیان ڕزگار بوو، وە هەر هەمان بەعسی بوون (سەلام عادلی) سکرتێری حشع یان لە ساڵی ١٩٦٣ لە سێدارەدا، سەرکردەکانی تریان پەنایان بۆ پارتی‌و بارزانی هێناو زۆر ڕێزی گرتن‌و پیاوەتی لەگەڵ کردن، لە پاشان بەگژ پارتیدا هاتنەوە، شانی خۆیان گڵاو کرد چەکی بەعسیەکانیان کردە شان‌و شەو و ڕۆژ بە دوای پ-م دەسووڕانەوە چەندین پ-م ی دلێرو قارەمانیان شەهید کردو چەندینیان تەسلیم بە حزبی بەعس کردو لە پاشان لە سێدارە دران ئەو هەڵوێستەی شیوعیەکان ئێستاش گەلی کورد بۆ نەوەکانی خۆی دەگێڕێتەوە..

پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول.. بەعسیەکان خۆیان بەهێز دەزانی‌و شیوعیەکانیان چەك کرد، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بیانووی گەورەتریان پێدەگرتن تا وای لێهات چەندین ئەندامیان لە سێدارەدان بە بیانووی ئەوە، کە نابێت کەس لەناو هێزە چەکدارەکانی عێراقی (جیش ـ پۆلیس ـ ئەمن) حزبایەتی بکات شیوعیەکانیش خۆشیان ئەم بڕیارەیان ئیمزاز کردبوو، بەرە بەرە شیوعیەکان جێگایان لێژتر دەبوو تا وای لێهات بەعسییەکان بە کۆمەڵ داوایان لە ئەندامانی حشع دەکرد، کە (بەرائەت) بدەن.

چەندینیان لێ خستنە زیندان، چەندین ئەندامی ئافرەتی شیوعیان لە زیندان (فساد) کرد بە ناچاری هەندێ لە ئەندامەکانیان هەڵاتن‌و خۆیان گەیاندە شۆڕش، لە ناوچەی ئێمە زۆر ڕێزیان گرتن‌و یارمەتیان دان وە هەر چی پێویستیان هەبوایە بۆمان جێبەجێ دەکردن لە

سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان کۆ دەبوونەوە دیارە تا ئەو کاتەش سەرکردەکانیان هەر بەتەمای چاك بوونی حزبی بەعس بوون.. ! پێم وایە (بنکەکانی حشع) گوێی بە قسەی سەرکردایەتی خۆی نەدا ناچار سەرکردەکانیان هاتن بە دوایاندا، لە پێشدا (فاتح رەسوڵ، یوسف قشە)، کە هەردووکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حشع بوون هاتنە ناو شۆڕش ئینجا بەرە بەرە سەرکردەکانی تریان.

گۆڕانی بارودۆخ لە ئێران زیاتر سەرکردایەتی حشع یان هاندا، کە دژی ڕژێم بووەستن، من چوباوەڕی شیوعیەتم خۆش دەوێ، ڕێزی هەموو ئەو کسانە دەگرم کە ئەو بیروباوەڕەیان هەڵگرتووە، شیوعیەکان لەلایەن بزوتنەوە دژایەتی دەکران ئێمە لای خۆمان دالدەمان دەدان لە هەندێ شوێن بەگوێرەی توانا چەکدارمان کردن وە لە هەموو ناخۆشیەك پارێزگاریمان لێکردوون.

لە سەرەتا هەڵوێستی حشع بەرامبەر ڕژێم ڕوون نەبۆوە، بەرامبەر حزبە سیاسییەکانی کوردستانیش هیچ هەڵوێستێکی ڕوونو ئاشکرایان نەبوو دیارە هەر حزبێکی بە ئەزمون کۆن لەگەڵ ڕووداوەکاندا ژیاوە بۆیە دەبێت هەڵوێستی خۆی هەبێت بەرامبەر هەموو ڕووداوەکان، حشع پەیوەندی دۆستانەی بەهێزی هەبوو لەگەڵ حدك و لەگەڵ کۆمەڵەی ڕەنجدەرانو کۆمەڵەی تەشەنگکێشانی ئێران بیروباوەڕیان زۆر لێك جیاوازبوو، ئەگەر دوژمن لە خۆی رابیینیایە کاری ئەو دوو ڕێکخراوەی دەکرد، چونکە بڕوایان بەوە نەبوو کە دەبێ گەلی کورد حزبی شیوعی سەربەخۆی هەبێ.

هەڵوێست بەرامبەر سۆڤیەت خاڵێکی تری ناکۆکی بوو، ڕووخانی ڕژێم یا چاککردنی هۆخەکە لەسەر دەستی ئەو ڕژێمە جیاوازیەکی تری بیروباوەڕ بوو، ڕوون بوونی هەڵوێستی شیوعیەکان بەرامبەر هەر یەك لە حزبە کوردستانیەکان کێشەی نێوانی یەکێتیو شیوعی زەقتر کرد، بەهەر حاڵ بەرامبەر بەو خراپانەی، کە کردیان دژ بە گەلی کورد.. جارێکی تریش کوردستان شیوعیەکانی لە هێرشو پەلاماری بەعسیەکان پاراست، بێگومان ئەو جارەیان هەموو ئەندامو دۆستێكو پ.م ی شیوعی ئەو ڕاستییەی بۆ ڕوونو ئاشکرابۆوە، سەرەڕای ئەو هەموو خراپیانەش هاوکاری لەگەڵ حشع بە قازانجی گەلی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردستان دەگەڕێتەوە.

## هێرشەکانی دوژمن

ساڵی ١٩٧٩ دوژمن لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٨/١ بە کۆپتەر هێرشی کردە سەر ناوچەی دەشتی هەولێر پاش شەڕێکی سەختو دژوار بە فەرماندەیی شەهید حوسێن دۆشکە برای شەهید ئەحمەد حاجی عەلی (١٤) پ.م لە حزبی سۆسیالیستی کوردستانی شەهید کرد، لە ناوچەی دیدەوان لە گوندی شێوەپیران چوار پێشمەرگەشی بەدیل گرت.. لە دوای بوونی سەدام بە سەرۆك کۆمار ئەو چوار پێشمەگەیە لە لێبوردنە گشتییەکەدا ئازادکران.

لە ڕۆژی ١٣/ ٨/ ١٩٧٩ هێزێکی تری دوژمن هێرشی کردە سەر دەشتی ناوچەی کۆیە.. لەوێش چواردە پێشمەرگەی شەهید کرد بە فەرماندەیی (شەفیق زاهیر) چوار پێشمەرگەشی بەدیل گرت، هەر چەندە شەوی ئەو ڕۆژە (عەفووی عام) دەرچوو.. بەڵام ئەو چوار قارەمانەیان لە مەعەسکەری کۆیسنجەق ڕەمی کرد! ئەو (١٨) پ.م پێشمەرگەی ی.ن.ك بوون.

کە سەیر دەکەین ژمارەو زیانو قوربانی پ.م لەو دوو هێرشە وەکو یەکە، بەڵام چوار دیلەکەی هێرشی دەشتی هەولێر، ئازاد کران. دوژمن جیاوازی ناکات بۆ کوشتنی کورد، ئەوانە: سۆسیالیستی دەکوژنو یەکێتی دەکوژن پارتی دەکوژن.. بەڵام خۆ هەمووی هەر کوردە دەکوژرێ، بۆیە لەسەرمان پێویستە بۆ کوردایەتی بەیەك چاو سەیری دوژمنەکانمان بکەین، چونکە دوژمن دوژمنی گەلی کوردە.

لەو ساڵەوە ه.پ.ك پەرەی زیاتری بەچالاکییەکانیدا، ڕۆژ بەڕۆژ دوژمن زیانی لێدەکەوت.

بەداخەوە لە زۆر شوێنی تری کوردستان شەڕو پێکدادان ڕوویدا بەڵام کورد..! کوردی کوشت..!؟ بە تایبەتی لە ناوچەی هەورامان پارتیو یەکێتی زۆر بە توندی بەگژ یەکتریدا هاتن.. چەندین تێکۆشەری گەلەکەمان لەو شەڕە بێ ئامانجەدا شەهید کران.

حکوومەتی عێراقی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٩ دەستی کرد بەخۆ ئامادەکردن بەرامبەر ئێران.. لە زۆر شوێن هێزەکانی خۆی کێشایەوە تاکو هاوینی ساڵی ١٩٨٠، لە ناوچەی هەولێر، دۆڵی بالیسان، دۆڵی هیران، ساوسیوکان، زینی وەرتی، زۆر لەو جادەو بانانەی وەکو دەشتی کۆیە دەشتی هەولێر چۆڵکرد.. هەرچی سەربازی هەبوو بەرەو خوارو ناوەڕاستی عێراقی برد، بەو جۆرە ناوچە ئازاد کراوەکان لە زیاد بووندا بوون، لە ناوچەی سلێمانیش.. زۆر شوێنی چۆڵکرد.

پێشمەرگە دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی لەو ناوچەنەدا بسووڕێتەوە. شۆڕشی کوردستانیش ڕۆژ بەڕۆژ لە گەشەکردنو بەرەوپێش چووندابوو.. شۆڕشی کورد لە ئێرانیش هەر بەرەو گەشەکردن دەڕۆیشت هەر چەند حکومەتی ئیسلامی ئێران نیازی هێرشی هەبوو بۆ سەر کوردستان.. بەڵام پێشمەرگەکانی دیموکراتو کۆمەڵە زۆر مەردانە بەرەنگاری هێزەکانی ڕژێمی ئێران بوونەوە.. لەکاتی هێرشو پەلامار، حزبی (تودەی) ئێران لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ناو ڕژێمی ئێران.. هەموو چەکو تەقەمەنیەکانی پێشکەش بە حزبی شیوعی عێراقی کرد، پارتی دیموکرات بەرە بەرە لەبن باڵی جمهوری ئیسلامی خۆی بەهێز کرد، دیارە لەو کاتەوە پارتی ڕۆژ بەڕۆژ پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێرانیەکان بەهێز دەکات، تا وای لێهات هاوکاری تەواویان لە رووی عەسکەریشەوە لەگەڵ یەکترکرد.

ی.ن.ك پەیوەندی لەگەڵ جمهوری ئیسلامی باش نەبوو هەر چەندە بەڕێز مام جەلال چاوی بە موتتەزیری کەوتو پەیمانی زۆر شتی پێدابوو.. ئێرانیەکان پەیمانیان بە یەکێتیدا، کە ڕێگای چەکو هاتوچۆ بکەنەوە، لە ڕاستیدا هەندێ چەکو کەرەستە لە سوریاوە بەڕێگای ئێران گەیشتە دەستی پێشمەرگە.

لە سەرەتای مانگی نیسان کۆبوونەوەی ی.ن.ك کۆتایی پێهات، کە لە پێش نەورۆز ئەو کۆبوونەوانە دەستی پێکردبوو مام جەلال هەردوو وتارەکەی خوێندەوە، کە بە نامیلکەیەك بە ناوی (جۆشدانی خەبات) لە کوردستان بڵاوکرایەوە، لە هەموو بارو دۆخەکانی کۆڵییەوە.. کۆبوونەوەکە هەڵوێستی ی.ن.ك بەرامبەر پارتی، سۆسیالیست، شیوعی، حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕژێمی عێراق، جمهوری ئیسلامی، سوریا، لیبیاو دەوڵەتە سۆسیالیستەکان ڕوونکردەوە. نەخشەو پلانی تازەی دانا بۆ پەرەپێدانی خەبات لەسەر گۆڕەپانی کوردستان.

هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی ی.ن.ك لە کۆبوونەوەی فراوانی ئازارو نیسانی ١٩٨٠ بەم شێوەیەی خوارەوە بوو :-

١. هەڤاڵ مام جەلال سکرتێری گشتی ی.ن.ك.
٢. هاوڕێ نەوشیروان.
٣. کاك سالار.
٤. مامۆستا جەعفەر.
٥. کاك مەلا بەختیار.
٦. کاك مولازم عومەر.

٧. کاك بەکری حاجی سەفەر.

٨. مامۆستا عەلی حەریز.

٩. کاك جەمال ئاغا.

١٠. مامۆستا نازم.

١١. حاکم عومەر عەزیز.

١٢. کاك عەزیز بەگ.

١٣. کاك عومەر مستەفا.

١٤. کاك د. فوئاد مەعسوم.

١٥. کاك کەمال فوئاد.

١٦. کاك کەمال خۆشناو.

١٧. کاك عادل موراد.

١٨. کاك عەبدولرەزاق فەیلی.

لە پاشان مام جەلال چووە دەرەوەی وڵات ماوەی تێپەری زیاتری پێچوو لەبەرئەوەی ئێرانییەکان رێگای گەڕانەوەیان نەدەدا، لەوماوەیەی، کە مام جەلال لە دەرەوە بوو.. کاك نەوشیروان مستەفا سکرتێری گشتی ی.ن.ك گرتە ئەستۆ، وە لە هاوینی ١٩٨٠.. بەیانێکی هاوبەشی لەگەڵ سۆسیالیست دەرکرد بۆ ئەوەی: شەڕی برا کوژی نەمێنێ.

پێم وایە هێشتا بەیانەکە نەخوێندرابۆوە لە هەندێ شوێنی جیاجیا ئەو ناکۆکیانە زیاتر دەتەقییەوە. من لەو کاتە هەلێکی گەورەم لەدەست خۆمدا چونکە زۆربەی هاورێکانم لەلایەن شۆڕشەوە نێردران بۆ بینینی دەورەیەکی رێکخراوی ئازادی خوازی فەڵەستین لە سوریاو لوبنان .

پێویستە بگوترێ رژێمی بەعسی عەفلەقی لە هاوینی ١٩٨٠ لە چەندین شوێن دەستی کوشندەی لە هـ.پ.ك وەشاندبوو لە قەرەداغ بە جارێك زیاتر لە (٢٠) پ.م. ی قارەمانی شەهید کرد بە فەرماندەی شەهید بێستوون.

لە رۆژی ١٧/ ٩/ ١٩٨٠ سەرۆکی عێراق سەدام حوسێن لەقسە کردنێکیدا بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی رێککەوتن نامەی جەزائیری هەڵوەشاندەوە..! بەم جۆرە لاپەرەیەکی رەش و ناخۆشی لە پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و ئێران کرایەوە.. کە تاکو ئێستاش ئەو پەیوەندیەیان هەر لە ناخۆشی دایە، کە راستەوخۆ لەسەر بارودۆخی کوردستان کاریگەری خۆی هەبووە.

## داستانی سماقوڵی

لە پاییزی ١٩٧٩ (حسك) کەوتە وتووێژ لەگەڵ عێراق، بۆ ئەم مەبەستە چەند نامەیەکیان گۆڕیەوە، وە د. مەحموود عوسمان چووە بەغدا.. دیارە نیازی حکوومەت لەو وتوێژە هەر ئەوە بووە، کە حزب ڕابکێشی بۆ لای خۆیی و لە کۆتاییدا بیکات بە داردەستی خۆیی و بەگژ شۆڕشی کوردی بکاتەوە.

لەکاتێکدا حزب بە فەرمی ئاگاداری هێزەکانی خۆی کردبوو.. کە هێرش نەکەنە سەر هێزەکانی ڕژێم لە ١٩٧٩/٢/٢٤.. هێزێکی گەورەی دوژمن، بە پشتیوانی فڕۆکەی هێلی کۆپتەر.. هێرشی کردە سەر گوندەکانی (سماقوڵی سەروچاوە، سماقوڵی گرتك) لەگەڵ هێزەکانی حسك تووشی شەڕێکی قورس بوون، هێزەکانی سۆسیالیست بە فەرماندەی هەڤاڵن کاك سەید کاکو شەهید سەید سەلیم و شەهید شینە بۆڵی و شەهید عەولا سوور بە ڕەنگاری هێزەکانی ڕژێم بوونەوە لە شەڕێکی قارەمانانەی کەم وێنە زەرەرو زیانی زۆریان لە سەربازەکانی دوژمندا حاڵی کەم هەشتا سەرباز کوژراو چەك و تەقەمەنی و کەرەستەیەکی زۆریشی دەسکەوت لەو شەڕەدا.

هێزەکانی دوژمن شپرزە بوون سەریان لێشێواو پەرتەوازەیان لێکرد. لەو شەڕە دوو فەرماندەی لێوەشاوەی حزبی سۆسیالیست، دوو جوامێری بە وەفای گەلی کورد.. دوو قارەمانی داستانەکانی شەڕی کوردستان.. کاك سەید سەلیم و کاك شینە بۆڵی.. کە هەردووکیان فەرماندەی هەرێم بوون شەهید کران. کاك سەید سەلیم بە گوللەی کۆپتەرەکان لەگەڵی سماقوڵی سەرچاوە شەهید کرا، کاك شینە بۆڵی بەهۆی گوللەی دوژمنان لە گوندی سماقوڵی گرتك گیانی پیرۆزی نەمری لەدەستدا.. لەو شەوە چەندین فەرماندەی تری پێشمەرگە، لەوانە شەهید ئەحمەد خان، شەهید سەرباز، کاك عەولا بۆر بەشداریان کرد.

شایانی باسە هەر ئەو هێزەی دوژمن بوو، کە هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێرو دەشتی کۆیە، کە بووە هۆی شەهید بوونی (٣٢) پ.م، کە لە سماقوڵی تۆڵەیان لێکرایەوەو بەسزای خۆیان گەیشتن.

بە شەهید بوونی کاك سەید سەلیم و کاك شینە بۆڵی حزبی سۆسیالیست. زەبرێکی کوشندەی لێکەوت تاکو ئێستاش نەیانتوانی شوێنی ئەو دوو فەرماندەیە پڕ بکەنەوە هەر ئەوەش بووە لاواز بوونی حزب لە خۆشناوەتی و مەلەکان و گەرەوان.

## گەشەکردنی شۆڕش

پاش ڕووخانی شا شۆڕشی کوردستان کەوتە قۆناغێکی نوێ، قۆناغی گەشەکردن‌و بەهێز بوون.

لە کاتێکدا دوژمنانی گەلی کورد، ئەو دوو دەوڵەتەی داگیرکەری کوردستان ناکۆکییەکانیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو توندی دەڕۆیشت بێگومان بەهێزیی‌و تواناکانی شۆڕش لەبرەودانـدا دەبێت، کەمبوونەوەی هێزەکانی دوژمن لە کوردستان، ئاوەڵا بوونی سنووری کوردستانی ئێران بۆ شۆڕشی کوردستانی عێراق، بووژاندنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتی ئێران، ئەو خاڵانەی سەرەوە هەموویان لە قازانجی گەلی کورددا بوون.

بەرە بەرە تێکۆشەرانی نوێ.. هاتنە ڕیزی خەبات چەکداری لە سەرانسەری کوردستان.. بەتایبەتی ئەو کادرانەی، کە لە زیندان ئازاد کرابوون لەوانەـ کاک فەرەیدون عەبدولقادر، کاک عەلی بچکۆڵ، کاک ئەرسەلان بایز، کاک جەبار فەرمان، کاک عومەر سەید عەلی، جگە لە زۆر کادرو ئەندامی تر لە شارەکان وەکو: شەهید جەمیل ڕەنجبەرو کاک سابیر ڕەسوڵ‌و کاک سەفین مەلا قەرەیی، مامۆستا بەکر کاک وشیارە سوورو مامۆستا کاوە، شەهید ئاشتی‌و شەهید شێخ سلێمان‌و مامۆستا ئەحمەد مەلا کەریم، وەزیرو کاک هاشم جهازو دکتۆر مەجیدو شەهید عومەر زێوەرو شەهید عومەر عەونێنەو شەهید مەجیدە سوورو شەهید سۆران‌و شەهید فوئاد گۆمەشینی‌و شەهید حسەن کوێستانی‌و کاک ئازاد جوندیانی‌و فەرماندەی تێکۆشەری ناوداری کۆیە ڕابەری سەید برایم‌و قارەمان شینەو شەهید جوامێرو شەهید تەحسین عوسمان دیبەگەیی‌و دەیانی تر لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان.

هەر چەندە حکوومەتی عێراق لە هاوینی ١٩٧٩ توانی زەبرێکی کوشندە لە ه.پ.ك بداتو بە زنجیرە کردەوەیەکی ئاسمانی‌و زەمینی توانی نزیکەی سەد پێشمەرگە شەهید بکات، بەڵام هەل‌و مەرجی دەرەوەو ناوەوەی ئەو کات لە قازانجی شۆڕشی کورد وابوو بە تایبەتی ی.ن.ك و پ.د.ك سوودیان لە گۆڕینی بارودۆخی ئێران وەرگرت توانیان چەك‌و کەرەستە پەیدا بکەن‌و حزبەکانی پێ بەهێز بکەن.

ڕێکخستن لە شارەکان سەر لەنوێ بووژایەوە، هەڤاڵان کەوتنە گەشەپێدانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو بزووتنەوەو یەکێتی هەڤاڵان کاک کۆسرەت‌و شەهیدان کاک عەبدولڕەزاق‌و کاک

عەبدوڵڵا ڕەشیدو هەڤاڵ عەبدوڵڵا تۆفیق‌و کاک بێستون‌و شەهید حەیدەر چوکل‌و کاک بەهرۆز دیسان بوونەوە ئەندامی کارامەی کۆمەڵە لە شارەکان.

پەیوەندییەکانی دەرەوەی شۆڕشی کوردستان.. بەرەو پێشەوە هەنگاوی هاویشت.. بەهۆی بوونی ڕێگای هاتووچوو بۆ دەرەوە.

بڕواو متمانەی خەڵك بەهێزتر بوو، مەترسی لە حکومەت کەمتر بۆوە، بەو جۆرە شۆڕش ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو سەرکەوتن دەڕۆیشت.

ه.پ.ك لە زیاد بووندا بوو، لە چەندێتی‌و چۆنیەتی، کەوتە چالاکی دلێرانە.. زەبری کوشندەی لە دوژمن وەشاند، ناوچە ڕزگار کراوەکان ڕۆژ بەڕۆژ فراوانتر دەبوو.

هێرش‌و پەلامارەکانی دوژمن بۆ سەر هێزی پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان کەمتر بوو لەبەرئەوەی ڕژێم بەشەڕی عێراق‌و ئێران سەرقاڵ بوو.

لە قووڵایی خاکی کوردستان هێزی پێشمەرگە دەستی کرد بە چالاکی.

# داستانی قەلاسنج

پاش جیابوونەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان، گەلێك کارەساتی دڵتەزێن ڕوویدا یەکێتی نیشتمانی کوردستان شێوازەی هێزەکانی لە ناوچەی هەولێر شلەژا بۆ ئەوەی هێزەکان ڕێك بخرێتەوە، یەکێتی لە ڕووی سیاسی‌و پێشمەرگەیی لە ناوچەی هەولێر گەشە بکات، سەرکردایەتی ی.ن.ك هێزی هەڵبژاردەی نارده ناوچەی هەولێر بە فەرماندەی شەهیدی نەمر کاك سەید کەریم، شۆڕشی ئەیلول شەهید سەید کەریمی بە خەڵك ناساندبوو، لە مەیدانی شەڕ یەکێك بوو لە پێشمەرگە هەرە ئازاو چاو نەترسەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەر بۆیەش شایستەی ئەوە بوو، کە فەرماندەی ئەو هێزە بخرێتە ئەستۆی ئەو. ئەو هێزە لە بناری پشدەرە ڕەقە لە نزیك گوندەکانی جەلك‌و مەمك‌و چوار گومان کەوتنە بەر هێرش‌و پەلاماری کۆپتەرەکانی ڕژێم لە ئەنجامدا چەندین کادرو پێشمەرگەی بە وەفا شەهید بوون لەوانە شەهید جەمیل ڕەنجبەر.

ئەو هێزە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٠/١٢/٤ گەیشتنە گوندی قەلا سنج لە بناری چیای سەفین، هێزەکە بۆ پارێزگاری کردن لە خۆیی‌و بۆ پشودان بوون بە دوو قۆڵ قۆڵێك لە قەلا سنجی سەروو مانەوە، کە سەید کەریم خۆی لەگەڵیان بوو، قۆڵەکەی تر چوونە قەلاسنجی خواروو، کە (٢)کم دەکەوێتە خوار قەلاسنجی سەروو.

ڕژێم بەهۆی نۆکەرەکانی زانی، کە ئەو هێزەی یەکێتی لە قەلاسنج ماوەتەوە هەر بەو شەوە ٤ـ١٩٨٠/١٢/٥، گەلە جاشێك لەگەڵ هەندێك سەرباز تابلۆقەی گوندی قەلاسنجی سەرویانداو خۆیان لە کەمیندا گرت تا لەگەڵ ڕووناکبونەوە پەلاماری پێشمەرگەکان بدەن. پێشمەرگەی کوردستان بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ زەفەری پێببات بەیانیان کەمین بۆ شوێنە گرنگەکان دەبەن. هەڤاڵێ لە قەلاسنج هەمان پلانیان جێبەجێ کرد بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج‌و ڕاکێشان بوو پێشمەرگەی کەمینەکان زووتر لە کاتی دیاری کراو واتە لەگەڵ ڕۆژهەڵات دەبێ دەوری خۆی بپشکنێ ئینجا تەسلیم بە پاسەوانی ڕۆژی بکات ئەوەیان نەکردبوو پێش ڕۆژهەڵات تابلۆقەی گوندەکانی تەنگتر کردو شەڕ دەستی پێکرد.

شەهید هاوڕێ (مامۆستا حەسەن) یەکێك لەو پێشمەرگانە بوو، کە لە کەمین زووتر هاتبووە خوارەوە، بۆ ئەوەی گیانی پێشمەرگەکان بپارێزێ هێرشی کردە سەر شوێنی کەمینەکەو دوو جاشی کوشت هەر لەوێدا مامۆستا کاوەو پێشمەرگەی ئازا کاك ئەنوەر شەهید بوون.

هێزەکەی تر تووشی سەر لێشێوان بوو هەندێکیان گوندەکەیان چۆڵ کرد شەهید سەید کەریم وەکو پڵنگ بەڵێ نەك پیاهەڵدان بەڵکو وەکو پڵنگی چنگ بە خوێن لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر کاك خدرو کاك تۆفیق گەرەوانی کەوتنە شەڕێکی قورس لەگەڵ ئەو هێزە زۆرەی دوژمن چەندین کەلاکی جاشیان لێخستن. لە هەمان کات ئەو هێزەی، کە لە گوندەکە چووبوونە دەرەوە، کە نەعرەتەی ئەو شێرەی زەمانەیان گوێ لێبوو گەڕانەوە. لە هەمان کاتیش هێزەکەی گوندی قەڵاسنجی خوارو بە فەرماندەی کاك ئازاد خۆشناو زیارەتیو ماموّستا ئەحمەد مەلا کەریم، کە ئەو کات ڕابەری سیاسی کەرتەکە بوو هاتن بە هانای براکانیان پاش شەڕێکی چەند کاتژمێری دوژمن شکاو چەندین لاشەی کەوتە دەست پێشمەرگە، دەستکەوتی چەكو تەقەمەنیو کەرستەی باشیش هەبوو(*).

ئەوانەی لەو شەڕە دەوری دیاریان هەبوو جگە لە شەهید سەید کەریمو شەهید ماموّستا کاوەو شەهید ئەنوەرو کاك خدرو تۆفیق، کەروانی، کە قەڵەم ناتوانێ پیاهەڵدانی ئازایەتیان بنوسێتەوە هەڤاڵێ شەهید قاسم نێرەگینی. هاوڕێ کاوە مەحموری کاك سەفین. مەلا غەفوور، ماموّستا بەکر.

بەڵێ داستانی سماقوڵی بە فەرماندەی هەڵۆی کوردستانی گەورە کاکە سەید کەریم ورەی بە دوژمن بەرداو چاوی هەموو جاشێکی شکاند.

ئەوەی پێویستە بۆتری بە درێژایی ساڵانی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان چەند ئەفسەرێك هاتنە ڕیزی شۆڕشو لە پێشەوەی خەباتدا بوون لەوانە مولازم عومەر عەبدوڵڵا مولازم حەسەن خۆشناو، مولازم جەمال ئەحمەد، مولازم فوئاد، مولازم عومەر عوسمان مولازم عەلی مولازم شێردڵو مولازم خولەو مولازم سمکۆ.

بەداخێکی زۆرەوە ئەم ئەفسەرانەش شەهید بوون:

مولازم سەید کەریمو مولازم حەسەن خۆشناو مولازم جەمال ئەحمەدو مولازم خولە.

---

(*) ئەوەی شایانی باسە لێرەدا شەهید عەولا سوور جوامێرانە بەهانای ئەو هێزە هات و دەستی چاك لە کۆپتەرەکان وەشاند وە زۆر بەداخەوە کاك سابیر ڕەسوول لەم شەڕەدا چاوێکی لە دەست دا.

## شەهید مولازم خولە

شەهید مولازم خولە ئەفسەر بوو لە سوپای عێراق لەبەرئەوەی کورد بوو لەریزی سوپا دەرکرا.
شەهید لە گولانی سالی ۱۹۸۱ پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد هەر زوو کرا بە فەرماندەی تیپی ۸۳ هەوری (خۆشناوەتی).

شەهید بەشداری دیاری هەبووە لە چەندین شەڕدا .

شەهید بۆ پشتگیری لە کوردەکانی برامان لە کوردستانی ڕۆژهەلات لەگەل تیپەکەی چوون بۆ کوردستانی ئەودیو لە شەڕێکی قارەمانانەوە کەم وێنەدا بە خەستی بریندار بوو، پاشان ڕەوانەی سوید کرا لەوێ بەڕووداوێکی دلتەزێنی ئوتۆمبیل گیانی سپارد.



شەهید
مولازم خولە

# شەهید سەید کەریم

شەهید سەید کەریم ئەفسەرێکی ئازای سوپای عێراق بوو.

شەهید لە شۆڕشی ئەیلول بەشداری کردووە لەبەر ئازایەتی و لێوەشاوەیی کراوە بە فەرماندەی بەتالیۆن لەهێزی سەفین.

شەهید پاش ڕێککەوتننامەی جەزائیر چووە بۆ سوریا لەوێ پەیوەندی بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان کردووەو بووە بە ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

شەهید سەید کەریمیش هەر وەکو شەهیدان عەلی سالح و محمد عەجەم تاقانەبووە.

شەهید لە زاتەکانی گوندی هاودیانی قەزای سدیق بووە.

شەهید لە تەمووزی ١٩٧٧ گەڕایەوەتەوە کوردستان بەڕێگای تورکیا.

شەهید لەبەر کارامەیی و ئازایەتی کرا بە جێگری فەرماندەی هەرێمی خۆشناوەتی و چەندین پلەی بڕیوە لە دەزگای پێشمەرگایەتی تا بووە بە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

شەهید لە کۆبوونەوەی شێنێ هەڵبژێردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە.

شەهید سەید کەریم فەرماندەی چەندین داستانی کردووە بە دەستی خۆی زۆر ئازا بوو. دوژمن و نۆکەرانی لە ناوی سەید کەریم تۆقی بوون.

شەهید سەید کەریم پیاوێکی راستگۆو دڵسۆز بووە.

شەهید لە ١٩٨٤/٩/١٥ لەکاتی گەڕانەوەی لە سلێمانی لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر لەکاتی موفاوەزات کەوتنە بۆسەی نۆکەرانی ڕژێم و شەهید کران، شەهید لەدوای خۆی دوو کچی بۆ نیشتمانەکەی بەجێهێشتووە.



شەهید مولازم سەید کەریم

## گرتنی هاوینە هەواری سەری ڕەش

سەری ڕەش هاوینە هەوارێکە لە نزیك هاوینە هەواری سەلاحەدین (١٥) کم دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی لوتکەی سەری ڕەش، هەولێر کۆنترۆڵ دەکات لەبەر فێنکیو خۆشو دلگیری مەلیکی سەردەمی کۆن قەسرێکی لێدروست کردووە، هەروەها سەدام حوسێنو عەدنان خەیروڵا هەر یەکە سەرو قەسری خۆش بۆ خۆشگوزەرانی خۆیان لێدروستکردووە، سەدان خانووی ئامادەکراوی پڕ کەلو پەلی فەرەنسیو ئیتالیو ئیسپانی تیادا دروستکراوە، ئەو سەرۆکانە هەمیشە جێگا خۆشو نایابەکانیان بۆ خۆیان هەلبژاردووە، خەلکیان بێبەش کردووە، تەنانەت بینینو سەیرانکردنیان لە هاولاتیان قەدەغە کردووە بۆ چوونە هاوینە هەوارەکان، ڕاستە نەوتی کەرکوکی خۆمان نەگبەتی بەسەر کوردا هێنا، هەر وەختە ئیقرار بکەم، کە هاوینە هاوارەکانیشمان بوونە بارگرانی بۆ میللەتی هەژارو بێچارەی کورد. نەوتێك، کە دلۆپێکی بۆ کورد نەگەڕێتەوە بە قازانج هەر بە تۆپو خومپارە بدرێ دەیا خوا وشك بێت.

هاوینە هەوارێکیش، کە هاولاتیان بە گشتی نەتوانن یەك مژی فێنك هەلمژن لە هەوای فێنكو بە دلی خۆش لە گازینۆکاندا دانەنیشین دەلێم: خۆزگە ئەو جێگا خۆشانەش هەر بە قوڕ دەگیران بۆ دەبێت هەر سەرۆکەکان لەخۆشیاندا بژینو ئێمەش لە دوورەوە باسی بکەین.

چەند جارێك پلانی گرتنی سەری ڕەش دانرا لەلایەن هەڤالی تێکۆشەر کاك کۆسرەت مانگی یازدە بە هۆی ڕێگا نەبوونی ئێمە پلانەکە هەلوەشایەوە.

لە ڕۆژی ١٣/١/١٩٨٨ کاك کۆسرەت بە بروسکە ئاگاداری کردین، کە بگەینە مەلبەند لە بروسکەکە باش تێنەگەیشتین لە جیاتی هەر تیپێك، (١٥٠) پ-م لەگەل خۆمان ببەین (١٥) پ-م مان برد، دایکردە بارانو بوبە لێزمە شەو لە سماق شیرین ماینەوە بەفرێکی زۆر باری ڕێگاوبان گیراو بەستی ڕۆژی ١٤/١/١٩٨٨ گەیشتینە سماقولی لەوێ داوای تەواوی هێزەکەی ت-٨٦ و ت-٨٧مان کرد ئەوانیش هاتن هەر چاوەڕوانی توانەوەی بەفر بووین، سەری ڕەش سپی دەچۆوە دەتوت ناوی سەری سپیە، بڕیارماندا بیگێڕین ڕۆژ خۆشی کرد هەوا گەرم بوو بەفرەکە بەرە بەرە لە دۆلو شیوەکان توایەوە بەهەرحالاً شەوانە لە مالی کاك کۆسرەت بە قسەی خۆشو (کەرەمستین) شەومان بەڕێ دەکرد هەموو شەوێك چەند جارێك باسی سەری ڕەشمان دەهێنایە مەیدان. لە یەکتری زویر دەبووینو ئاشت دەبووینەوە.

برادەری یەکتر بووین، هەزار بابەتو قسە دەهاتە مەیدان، هەر کەسە بە ئارەزووی دڵی خۆی قسەی دەکرد.. چی لە هەگبەی تێکۆشەران بوو لە گلەییو گازندە لە یەکتری دەکرا، شەو درێژ بوو، لە سماقوڵی قوڕو چڵپاو سەهۆڵ بەندان لە کونجی خانوویەکی تاریکی کردبووین، دوور لە ئازیزو یاران جاروبار دڵمان تەنگ دەبوو، جار جارە قسەی خۆشی مام غەفوور دڵمانی خۆش دەکرد، دەستو سمێڵی مامۆستا بەکر هەزار بیرکردنەوەو لێکدانەوەی بۆ دەکرا، سەگە سمەی کاک شاخەوانیش دەیان یادگاری کۆنو نوێی زیندوو دەکردەوە، کاک کۆسرەتیش جگە لەوەی بە گاڵتەو گەپ دڵی دەداینەوە بێ گوێزو هەنگوینی نەدەکردین. فەرماندەکان هەر کەسە شوێنی خۆی دەزانی لە چالاکی سەری ڕەشدا.

لە ڕۆژی ١٩٨٧/١/٢٥ ئێوارە لە ماڵی مام سەعید سۆفی نانمان خواردو بەیانی لە زیارەت بەڕێکەوتین بەرەو سەری ڕەش بۆ ئەوەی قەسری سەدام بروخێنینو پاکی بکەینەوە لە داگیرکەرانو نۆکەرەکانیان.

کە لە زیارەت بەڕێ کەوتین هەور بەتەواوی ئاسمانی گرتبوو، مەترسی بارانو بەفر دەکرا هەندێك نانو خواردەمەنیمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت ئێوارە لە گوندی قیژە بارمان خستو هەرچیمان پێبوو خواردمان زۆر سارد بوو بەرەو شەڕیش دەڕۆین کەس نازانێ چارەنووس چییە..!

پاش کەمێك شەهید نامق هاتە لای کاك کۆسرەت فەرماندەکانیان بانگ کرد من ئەو کات کاك نامقم نەئەگیناسی چەکداری ڕژێم بوو لە سەری ڕەش ئەو چاوساغمان بوو هەموو شوێنەکانی پێناسان بوو وتی: تەنیا ئەو شوێنەی ڕێباز لەگەڵ تیپەکەیان بۆی دەچێ سەختەو ناخۆشە چونکە ماڵی سەدامە مەترسیم پەیدا کرد، بەڵام هەرگیز گوێم پێنەداو خۆم نەبوارد، بەڕێ کەوتین بەلاکە لاك توولە ڕێگامان گرت بە فرمان شێلا بەو سەرمایە ئارەقمان دەکردەوە چونکە ڕێگاکە زۆر هەوراز بوو ئەو ڕێگا بڕینە سێ کاتژمێری تەواوی خایاند گەیشتینە یەکەم ڕەبیە بێ تەقە خۆیان دابەدەستەوە، ئەوان لەگەڵ خۆمان بوون. چوومە ناو ڕەبیەکە هەندێك خواردنی تیابوو لەگەڵ برادەران خواردمان ئای چەند بەتامو بەلەزەت بوو چەند بڵێی سەرمابوو چایەکی ترمان لێنایەوە، هێشتا کاتی هێرش کردن مابوو.

تەمو مژ سەری ڕەشی داگرتبوو کەس کەسی نەدەبینی، پێشمەرگەکان لە دۆڵێك ڕاوەستابوون کە پڕ پڕ ببوو لە بەفرو هەر بەفر دەباریی، لەبیرمە پێشمەرگەکان لە سەرما هەڵدەپەڕینو نەیاندەزانی چی بکەن.

کاتژمێری سفر.½ پاش نیوەشەو بوو ئەو کاتە نەدەهات حەزمان دەکرد زوو کارەکە بکەین تا لە سەرماو بەفر ڕزگارمان بێت، ئەو کەسانەی کە گاڵتە بە پێشمەرگایەتی دەکەن، بابێن پێشمەرگەو بەفرو سەرماو سەری ڕەش ببینن ئینجا دان بە قارەمانیەتی پێشمەرگەدا بنێن، خۆزگە هەموو کوردێك لەو شەوە لەوێ دەبوو ئەوجا دەیزانی کوڕانی مەڵبەندی سێ چەند قارەمان و دلێرن چەند خۆڕاگرو کۆڵنەدەر بوون، کە بەرامبەر بە دوژمن و بەفرو سەرما شەڕیان دەکرد.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەر لە خۆیەوە نەبۆتە خۆشەویستی خەڵك، هەر لەپەنا قسەی زلی بێ ناوەڕۆك خۆی نەشاردۆتەوە سەری ڕەش و سماقوڵی و بالیسان و دابان و هەلاج و گوجاڕو دەیان داستانی تر وای لێکرد، کە خۆشەویستی لەناو خەڵك زیاد بکات. شەڕی سەری ڕەش گەواهیە بۆ پێشمەرگەکان، کە چەند بۆ بیروباوەڕەکەیان و بۆ گەلەکەیان وەفادار بوون.

لە چوار قۆڵەوە لە کاتی دیاریکراو هێرش کرایە سەر مۆڵگاکانی دوژمن لە سەری ڕەش بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم:** ت ٨٥ ی بەڕانەتی بۆ سەر قسری مەلیك و مەشجەبەکان لەگەڵ دوو کەرتی ٨٧ ی قەرەچۆغ بە فەرماندەیی کاك بورهان و کاك ئاسۆو کاك کەریمە ڕەش لە ماوەیەکی کورت دەستی بەسەر گیراو تەفروتونا کرا.

**دووەم:** ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەیی ڕێباز فەرماندەی تیپ و کاك مەلا سلێمان جێگری فەرماندەی تیپ بۆ سەر قسری سەدام و عەدنان خەیروڵاو بارەگای سریەی قوات خاسەو هەردوو مودەرەعەی بەر دەرگا، کە بە ماوەی چارەکە کاتژمێرێك گیراو قسرەکەش تەقێنرایەوە، پاشان هەر زوو بە جیهاز قسەم لەگەڵ کاك کۆسرەت و مامۆستا چەتۆدا کرد کە لەگەڵ کاك شاخەوان و کاك تەحسین کاوانی چاودێری بارو دۆخەکەیان دەکرد، لەبیرمە وتیان: لە کوێوە قسە دەکەی وتم: لە ماڵی کاکم سەدام..!.

**سێیەم:** ت٩١ ی سەفین بۆ سەر بارەگای فەوجی جاشەکان بە بیست دەقیقە دەستی بەسەردا گیرا بە فەرماندەی هەڤاڵ سەفین مەلا قەرە لەبیرم باش ماوە ئەویش هاتە ناو قسرەکەی سەدام بە هەردووکمان سەیرمان دەکردو سەرمان لێدەرنەدەکرد، دەموت بە چ جۆرێك دروستکراوە ئای خەڵکی هەژارو بێ دەسەڵات..!

**چوارەم:** هەندێك لە کەرتەکانی ت٨٥ ی بەڕانەتی بۆ سەر ڕەبیەکانی دەوروپشت و کابینەکان بە فەرماندەی کاك عوسمان بانی مارانی و کاك حاجی مەسیفی.

**پێنجەم:** کەمین لەنێوان مەسیفو سەری ڕەش بە فەرماندەیی مام غەفووروو بەڕێز مامۆستا ئەحمەد حەمەد ئەمین بوو، بەڕاستی دەستێکی باشیان لە هێزەکەی دوژمن وەشاند، کە بە هانای هێزەکەی سەری ڕەش هاتبوون، هەندێ چەكو تەقەمەنیشیان دەستکەوت.

**شەشەم:** قۆڵی ڕادارەکە بە فەرماندەیی شەهید هاشم شەمامکیو کاك عومەر ناسر بوو، لەو شەڕە قارەمانانەیە قەسری سەدام تەقێنرایەوەو زیاتر لە هەزارو دووسەد کلاشینکۆفو بی کەی سیو ئاربیجیو چەکی تر دەستکەوت. چەندین جیهازی ڕاکاڵ دوو دەبابە سووتێنرا چوار مودەرەعە شکاو سووتێنرا، زەرەری ماڵیش هەبوو.

کاك کۆسرەت هاتە قەسری مەلەکی کۆنو زۆر سەرمابوو پێشمەرگە لە برسانو لە سەرمان هەر دەلەرزی دەبوایە هەر پێشمەرگەیەك دوو چەکی زیاتر لەگەڵ خۆی هەڵگرێ بۆ خوارەوە. کاك کۆسرەت زویر بوو دیسان هەندێ قسەی کرد، زۆر بە برادەرێکی هەڵکوت دیسان ئەوەمان خستەوە پێش چاو ئەو سەرکەوتنە گەلێك گەورەیە مێژوو دەینووسێتەوە با چی چاکە وابکەین من بە هاوکاری لەگەڵ هەڤاڵ مامۆستا بەکر زۆر خۆمان ماندو کرد بۆ گواستنەوەی چەکەکان زۆر دواکەوتین، بەیانی بەسەرداهات منو کاك کۆسرەتو مامۆستا بەکر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك ماینەوە کاك سەفینیش خەوی دەهات وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی پەلەمان کرد هاتینە خوارەوە. هەرگیز بارانی وا بەتینو تەوژمم لەو ساڵەدا نەدیبوو، ڕووبار هاژەی دەهات جلو بەرگمان ئاوی لێدەچۆڕا. من دەمزانی دانیشتن خراپە هەرگیز دانەنیشتم هەندێك لە پێشمەرگەکان لەبەر ماندوو بوون دانیشتن زۆرمان هەوڵدا بە قسەیان نەکردین لە برسانو لە سەرمان گیانیان لە دەستدا بەڵێ لە دەستدانی ئەو حەوت قارەمانە، ئەو حەوت شێرە ئەو حەوت فریشتەیە، ئەو حەوت پیاوە جەربەزەیە، ئەو حەوت گیان لەسەر دەستە، پڕکردنەوەی نیە چونکە کوڕانی ڕۆژی سەری ڕەشو شەوانی تاریك بوون کێ هەیە وا گیانی لەلا ئاسان بێت دەك لە گۆڕیش هەر شادبن دڵنیابن هەمیشە لەگەڵ ئێمەن هەر ناوتان زیندووە.

ئێمەش زۆر بە ئاستەنگ گەیشتینەوە سوسێ ئەوەندەی نەمابوو گیانمان لەدەست بدەین. بۆیە دەبێ پێشمەرگە لە ڕۆژانی ئاوادا هەمیشە خورماو پیازو خواردەمەنی هەڵگرێ.

لەو شەوە پڕ لە سەرەوەریە، لەو داستانە مێژووییە، لەو نەبەردە کەم وێنەیە لەو سەرکەوتنە پڕ واتایە یازدە ڕۆڵەی تری گەلەکەمان یازدە پاڵەوانی تری شۆڕش لەگەڵ یازدە پڵنگی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان یازدە پێشمەرگەی مەڵبەندی (٣)ی خۆشەویست گیانیان بەخشی بە خاكو وڵات یادیان بەخێر.

داستانی سەری ڕەش یەکێکە لە سەروەریەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە گشتیو مەڵبەندی (٣) بە تایبەتی. بۆ بەیانی هەواڵی گرتنی سەری ڕەش لە هەموو کوردستان دەنگی دایەوە ئێسگەی لەندەن بە دوورو درێژی باسی ئەو سەرکەوتنەی کرد. من لە سوسێ لە ماڵی کاك تەحسین مامەوە پاش پشوودان گەڕامەوە سماقولی[*].

چەند ڕۆژێکی تر لە مەڵبەند ماینەوە بڕیارماندا، کە جاشەکانی دێگەڵە تەمبێ بکەین دووبارە چونکە ڕێگایان لە هەندێ ئافرەتی ماست فرۆش گرتبوو، بەڵام لە ترسان پەیوەندییان بە ئێمەوە کرد لە هەڵکانیان پەشیمان بوونەوە. هێزەکانمان ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٦ گەڕایەوە شوێنی تایبەتی خۆیان.

لە سەرکردایەتی هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتی بروسکەی بۆ کاك کۆسرەت کرد، کە بچێت بۆ سەرکردایەتی. من لەگەڵ کاك کۆسرەتو مامۆستا چەتۆ لە ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٧ بەرێکەوتین بۆ دەشتی هەولێرو کۆیە لە نزیك گوندی تەکەور دانیشتین قسەمان کرد ئەو ڕۆژە لە گوندی مەرزان پشوماندا. لە ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٨ کاك کۆسرەتو برادەران بەرێکەوتن بۆ سەرکردایەتی منیش گەڕامەوە لای پێشمەرگەکان.

دیارە لێرەوە شۆڕش دەکەوێتە قۆناغێکی تر دوژمن لە بەرگریکردن بۆ پەلاماردان پیلانی خۆی دانا. لە شوباتی ١٩٨٨ دوژمن دەستی کرد بە هێرش کردنە سەر کوردستان لە چەندین کردەوەی جیاجیا توانی زۆربەی ناوچە ڕزگار کراوەکان لە دەست پێشمەرگە دەربهێنێ، کە لە پاشان هەریەکە لەو شەڕە لەو کارەساتانە بەجیا دەگێڕمەوە چونکە هەندێ ڕووداوی مێژوویی تیایە پێویستە زۆر بەڕاشکاوی بگوترێ.

---

[*] ئەو نووسینەم لە گەڵی دەرماناو لە بناری سەربەن (مەسیف) لە ساڵی ١٩٨٩ لە پارتیزانی نووسیەوە بۆ یادگاری.

## ڕۆژانی ڕەش خوێندنگەی دلێرانە

## داستانی سماقوڵی

ساڵی ١٩٨٦ دوو نموونەی تری زیندوی خۆڕاگری کوردەکان لە دۆڵی سماقوڵی لە هیچ کاتو بارو دۆخێکدا دوژمن نەیتوانیوە دۆڵی سماقوڵی بکاتە مۆڵگای هەمیشەیی هێزەکانی خۆی بەڵکو بە پێچەوانەوە هەردەم وەکو درك بووەو لە چاوی بەعسیەکانی بەغدا چەقیوە. مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ لە سنووری پارێزگای هەولێر بنکەو پشودانو هەڵسانەوەیانو جوڵانەوەیان لەو شوێنە پیرۆزە بووە. هەر بۆیەش بەعسیەکانو پێش بەعسیەکانیش گرنگی ورد بۆ سماقوڵیەکان کراوە.

لە وەتی من بەبیرم دێ هیچ شەڕێك لە دۆڵی سماقوڵی وەکو شەڕی یازدە شەو و ڕۆژی ساڵی ١٩٨٧ نەبووە چونکە لە وەتی کورد لە ژێر دەستی زاڵمەکانی عێراقەو داگیرکراوە هەرگیز ڕژێمەکان وەکو ئەو ساڵە بەهێزو توانا نەبووە، بڕواش ناکەم هەرگیز ئەوەندە چەکداری خۆفرۆش پشتی ڕژێمی عێراقیان گرتبێ دژی ڕۆڵەکانی وڵاتی خۆیان پێش ئەوەی بێمە سەر باسی شەڕەکە دەبێ کەمێك بگەڕێینەوە دوواوە چونکە هەموو شەڕێك هۆی خۆی هەبووە هەر چەندە نابێ تکۆڵی لەوە بکەین دوژمن هەموو هەلێك دەقۆزێتەوە بۆ تەفرو توناکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردو هەر کاتێك بۆی لوا بێ درێغی نەکردووە.

لە ساڵی ١٩٨٥ یەکێتی نیشتمانی کوردستان وتوێژی لەگەڵ حکومەتی عێراق پچڕاند ناگەڕێمەوە سەر ئەو بابەتە، چونکە چاکەو خراپەی لە کاتی خۆی باس کراوە پێویست بەدووبارە کردنەوەی ناکات.

سەرکردەکانی بەعس ئەوەندە لە خۆبایی‌و لاسار بوون بۆ چەسپاندنی مەرامە گڵاوەکانی خۆیان وا هەڕەشەیان دەکرد گوایە ئەگەر سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەڕ بکاتەوە ئەوا بە توندی لە کورد دەدەن، ئەگەر کابرایەك سیاسەتی بەعسیەکانی لا ڕوونو ئاشکرا نەبوایە وای دەزانی بەعس هەر خێرو بەرەکەتی بەسەر کوردەکاندا بارانەدوە هەرگیز بە کۆمەڵ خەڵکی نەکوشتووە، هەرگیز زنجیرە گوندەکانی سەر سنووری چۆڵ نەکردووە بە لێشاو عەرەبی بۆ کەرکوكو خانەقینو زمارو تەلەعفەرو شەنگارو دووزو کەندیناوە نەهێناوە ئەوە حکومەتێکی تر بووە..!

به هەر حاڵ شەڕ دەستی پێکردەوە پێشمەرگە قارەمانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە تەنیا، بەڵێ بە تەنیا بە ڕەنگاری ئەو هێزە زۆرو بە توانایەی بەعس بوونەوە دەستی کاریگەریان لێوەشاندن لە گەرمیانەکانی کەرکوك بگرە تا قەراج و قەرەچۆغ شەڕی مەردانە کرا دوژمن لە ئاستی دلێری و خۆڕاگری پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەری سوڕما کەوتە دانانەوەی پیلانی گڵاو لەسەرەتا بەرەیەکی شەڕی چەند مانگەی لە نزیك بارەگاکانی سەرکردایەتی کردەوە بە بیانووی کردنەوەی ڕێگای قەیوان و توندکردنی سنوورەکانی لە نزیك ناحیەی ماوەت پێشمەرگەکانی سەرانسەری کوردستان بەشداریان لەو شەڕە کرد ئەو شەڕە ناوبانگی دەرکرد بە شەڕی (قەیوان ماوەت). پاش ئەو شەڕە دوورو درێژە داگیرکەران توانیان هەندێك چیاو قوچ و دۆڵ داگیر بکەن، بۆ ئەوەی مەترسی لەسەر سەرکردایەتی نەمێنێ هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە نیسانی ١٩٨٧ هێرشی بەربلاویان کردە سەر گۆجارو باخ و حەجە لەرزۆك و کوڕەنگ و قەیوان و ئەزمەڕ و لاغلو بەچەند کاتژمێر سەدو چوارەد ڕەبایەو چەندین بارەگای فەوج گیران و ئەو ناوچانە لە دوژمن پاککرانەوە دوژمن هێرشی پێچەوانەی دەست پێکردەوە توانیان بە چەندین ڕۆژ شەڕی قورسی شوێنەکان بگرێتەوە.

هەر لە نیسانی ١٩٨٧ تاکو مانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ بەعسیەکان چەکی کیمیاویان دژی پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان بەکار هێنا شێخ وەسانان و وەرتێ و هەڵەبجەو بادینان و دۆڵی جافایەتی گەواهی دڕندەیی ڕژێمی بەعسیەکانن.

پاش داستانی ڕزگاری مەڵبەندەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستیان کردەوە بە زەبر وەشاندن لە هێزەکانی بەعسی داگیرکەر.

بارەگای مەڵبەندی (٣) کە سەرپەرشتی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەکرد لە پارێزگای هەولێر بارەگای لە سماقوڵی و سەرچاوە بووە پێویستە ئەوەش بڵێین ئەو مەڵبەندانە لە ڕووی ڕێکخستن و دارایی و پڕوپاگەندەو کۆمەڵایەتی و پێشمەرگایەتی لێپرساو بوون لە سنووری ناوچەکەی خۆیان. مەڵبەندی (٣) چەندین چالاکی مەزنی لە ماوەی سێ مانگدا نواند:

<u>یەکەم:</u> گرتنی شارۆچکەی تەق تەق بە هاوکاری لەگەڵ پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ ی کەرکوك و تیپی ٢٥ ی خاڵخاڵانی سەر بە مەڵبەندی (٢) ی.ن.ك.

<u>دووەم:</u> گرتنی قاتعی جەیش شەعبی، لە گوندی سێ قوچان بوو بە ناوی قاتع ئەبو جەعفەر مەنسوور کە زیاتر لە سێ سەد پارچە چەکی لێ دەسکەوت و بە دەیان بۆرە زەلامی بۆگەنی بەعسیەکانی تیا کوژران.

**سێیەم:** گرتنی کارگەکانی نزیك هەولێر لەلایەن تیپەکانی ٨٦ی دەشتی هەولێرو ٨٧ی قەرەچوغ.

**چوارەم:** لێدانو پاککردنەوەی گوندەکانی مشارو هەوارغەر لە عەرەبە تەعریبەکان لەلایەن پێشمەرگەکانی تیپی ٨٧ی قەرەچوغ.

**پێنجەم:** گرتنی چەندین ڕەبایەو چەندین چالاکی جیاجیای ناو شارەکانو چەندین چالاکی جیا جیا لەلایەن تیپە قارەمانەکانی ٨٥ی بەرانەتیو ٩٣ی کۆیەو ٧٨ی کارۆخو کۆڕەك ئەنجامدرا.

**شەشەم:** گرتنی ناحیەی شۆڕش (دێگەڵە)، لە دوو فەوجی خۆفرۆشەکان پاککرایەوەو سەدان پارچە چەك دەسکەوت.

**حەوتەم:** چۆلکردنی ناحیەی هەیران لەلایەن دوژمنەوە لە ترسی پەلاماری کتو پڕی پێشمەرگەکانی مەڵبەندی ٣ ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو شەڕە قارەمانانەی، کە لە سەرەوە باسمان کردن هەر یەکە داستانێکە نووسینەوەی سەربەخۆی دەوێ هەر یەکێك لەو شەڕانە چەندین شەهیدی قارەمان بەخوێنی گەشیان تۆماریان کردووەو لەوانە شەهیدان مەنافو ئازاد دار بەسەری ئەو دەست وەشاندنە بە هێزانە زەمینەیان خۆشکرد بۆ شەڕی گەورەی سماقوڵی نیازم وابوو چیتر لەسەر شەڕو شۆڕەکانی کوردستان نەنووسم بۆ ئەوەی نەکەومە بەر تانەو تەشەنە جنێو خۆ دەزانین دەبێت تەنیا دەوری ئەو کەسانە بنووسم، کە جێگا دەستیان دیار بوو خەڵك بەگشتی دەزانن، بەڵام چی بکەم هەندێ کەس دەیەوێ قەڵەمەکەم بلەرزێنێ ڕاستیەکانم پێ بگۆڕێ، کە هەرگیز لەمن ناوەشێتەوە داستانی سماقوڵی خۆڕاگری پێشمەرگەکانی کوردستان لە بنەباوی جێگای چاوقوچاندن ناهێڵێتەوە دووسەدو شەستو چوار کاتژمێر شەڕی ڕووبەڕوو ترسو لەرزی شکاندم بەبیرم هاتەوە ڕۆژانی ئەو شەڕە شەوانی دژواری سماقوڵی، کە دیسان نەترسم.

تازە لە کۆنگرە لێبوینەوە لەلای هەڤاڵی خۆشەویستم مامۆستا بەکر دانیشتبووم لەگەڵ دوو مامۆستای پەیمانگە یادی ئەو شەڕەمان کردەوە داوایان لێکردم چەند دەربارەی گەلەکەم دەزانم، ئەو میللەتە هەژارو لێقەوماوەی کورد ئاشنا بکەم بۆ ئەوەی بزانن کوڕەکانیان نەك هەر داستانی سماقوڵی تۆمار دەکەن، بەڵکو زاڵمو زۆردارانیش لە ڕەگو ڕیشە دەردەهێنن.

## ٢٦٤ كاتژمێر

## لە داستانی سماقوڵی

کاتژمێر (١٠)ی شەو بوو لە گوندی سێ کانیان لەسەر زێی بچووك بەرامبەر شێخ بزێنی بووم پێشمەرگەکەی لەسەر ئامێری بێ سیمەکە کاکە ئایزن بانەموردی بوو، بەپەلە هاتە لام بروسکەیەکی دایە دەستم، کە سەیرم کرد پەشۆکام نوسرابوو دەبێ هەر ئەمشەو بگەینە سوسێ چونکە دوژمن هێزی هێناوە بۆ سەر سماقوڵیو بارەگای مەڵبەندی ٣، سەرتیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بووم پێشمەرگەکانمان بێ ئاگا هەرکەرتو مەفرەزەیەك بەلایەك ڕۆیشتبوون بۆ بەنزین پەیداکردنو نان خواردن.. ماوەیەکی زۆربوو پشومان نەدا بووهەر بەشەڕو شۆڕ خەریك بووین. هەمان بروسکەش بۆ تیپی ٨٧ قەرەچۆغ هاتبوو زۆرم هەوڵدا بە شەو هیچ هێزێکی ئەوتۆم بۆ کۆنەکرایەوە بە ناچاری ئوتومبیلەکەی خۆم یەك کەرتی پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد، کە ژمارەیان لە بیستو پێنج پێشمەرگە زیاتر نەدەبوو لە کاتێك سەرجەم تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر خۆی لەسێ سەدو بیست پێشمەرگە دەدا. کاك کۆسرەت، کە لێپرسراوی مەڵبەند بوو بڕوای بە قسەکانی ئێمە نەدەکرد، هەڵوێستیشیان لە سماقوڵی بەرامبەر دۆخەکە خراپ بوو نایشارمەوە لەسەر جیهازەکە هەندێ قسەی بەمنو مام غەفور وتبوو، کە جێگای خۆی بوو دڵمان گەرد بگرێ، بەڵام لە دێر زەمانەوە هەر وابووە دەبێ برا بچووکەکان قسەی برا گەورەکانیان لێك نەدەنەوە. پێتان سەیر نەبێ ئەو کات هەموومان یەك بەرژەوەندی کۆی دەکردینەوە ئەویش شۆڕشو گەلو دوژمن شکاندن بوو، بەناشکوری نالێم دنیا وەکو ئێستا نەبوو جادەو خۆشیو پارەو پوول کەس بیری لێنەدەکردەوە، کەس مەزندەی بۆ ئەو شتانە نەدەکرد بەڵکو بە سووكو چروکی دائەگینان ڕۆیشتم تا نزیك جادە لە ڕێگا تووشی مەفرەزەیەکی تیپی قەرەچۆغ بووم، کە ئەو جاشانەیان بردبووە مەڵبەند کەلە دێگەڵە گیرابوون، لە ڕێگا دەگەڕانەوە پرسیارم کرد وتیان: جادەی کۆیە گیراوە ئەستەمە دەرچوونتان چونکە شەوە نازانن دوژمن لە کوێیە، دەبێ پێشمەرگە بە ڕۆژ بە دووربین جێگاو ڕێگای دوژمن دیاریکاو بزانێ ئینجا شەو دەتوانێ بڕوا، گەڕامەوە بەدڵێکی پڕ لە خەفەتو لە نێرەگین مامەوە ڕۆژهەڵات لە دوایدا هێزەکەمان نارد، ڕۆژی ١٩٨٧/٩/٧ لەگەڵ تیپی ٨٧ی قەرەچوغ بۆ ئێوارە بەرێکەوتین بە ئاستەنگ لە جادەی هەولێر- کۆیە پەڕینەوە قۆپیەکانی سەرپیەرو باوەقوبو گۆمەتاڵو ئەوناوەش گیرا بوو بە هەر حاڵێ کاتژمێر نزیك ١٢ی شەو بەسەر چیادا

سەرکەوتین لە دیوی قورتە لاس‌و کانی بی جاشەکان سەنگەریان گرتبوو ناوی خوامان لێهێنا ڕێگای خۆمان پاك کردەوە زەبرمان لە جاشەکاندا هەڵاتن بە جیهاز لەگەڵ کاك کۆسرەت قسەم کرد لەوێ ڕێ‌و شوێنی ئێمەی دیاری کرد بەم شێوەیەی خوارەوە:-

تیپی ٨٧ قەرەچوغ بۆ بەنەباوی لە نزیك کروژ تاکو بەرامبەر عەلیاوە.

تیپی ٨٦ دەشتی هەولێر بۆ سەر (قۆپی سوسێ) و (وشکۆر) و (بەنەباوی) لەلای (زیارەت) تاکو بەرامبەر ونکە.

بەڵێ ڕۆژی ١٩٨٧/٩/٨ ئەو شوێنانەمان گرت، کە بۆمان دانرابوو، هێزەکانی تریش بەو شێوەیەی، کە پێشتر بۆیان دیاری کرابوو دامەزرابوون. ئەو ڕۆژە دوژمن بە هەموو جۆرە چەکێك تۆپ، ڕاجمە، کۆپتەر، میك، سیخۆی، پیادە شەڕی لەگەڵ کردین بەڵام نەمان هێشت پێشڕەوی بکات دوژمن لە چەندین لاوە هێرشی دەکرد توانیبووی گوندی زیارەت‌و دۆڵی ونکەو عەلیاوە تاکو قورتە لاس بگرێ لەسەر چیای کانی شیلان تاکو جادەی هیران سولاوك لەسەر چیاکە پێشڕەوی کردبوو لە شەقڵاوە تاکو گردی جاسوسان، بەرەی شەڕ بەم شێوەی خوارەوە دابەش کرابوو:-

١. **قۆڵی هیران:** پێشمەرگەکانی تیپی ٩١ی سەفین‌و تیپی ٧٨ی کارۆخ بەرگریان لە هیران‌و جادەی هیران شەقڵاوەو قوپیەکانی ئاوەگردی دەکرد هەڤاڵێ سەفین مەلا قەرەیی‌و کاك سامان گەرمیانی‌و کاك حوسێن بندایزانی سەرپەرشتی هێزەکانیان دەکرد، لە ماوەی ئەو یانزە ڕۆژەی شەڕ دوژمن هەزاران گوللە تۆپی نا بە سەنگەرەکانی پێشمەرگەوە بە دەیان جار کۆپتەرەکان سەنگەری پێشمەرگەکانیان بۆردومان کرد، وە چەندین هێرشی پیادەی یەك لە دوای یەکی کردە سەریان لە هەمووی شکا زەرەرو زیانی زۆر لێکەوت لە هەر دوو شوێنەکەی، کە لە سەرەوە باسمان کرد دوژمن تەنیا توانی گردی جاسوسان لەسەر جادەی گشتی شەقڵاوە - هیران داگیر بکات وە لەسەر چیای سەفین هەندێك پێشڕەوی کرد (کەرکی گەروتەو قۆپی دارەبەنی) داگیر کرد بەڵام پێشمەرگەکان هەر زوو (قۆپی دارەبەنیان) لێوەرگرتنەوە، لەو شەڕو پێکدادانە کەم وێنەیەدا کاك حوسێن بندایزانی فەرماندەی تیپی ٧٨ی کارۆخ گیانی پاکی پێشکەش بە خاکی نیشتمانەکەی کردو بەسەر بەرزی چووە کاروانی شەهیدان، هەروەها باوکی شەهیدی ناوبراو لە هەمان تۆپ شەهید کرابوو.

٢. **قۆڵی سولاوك:** دوژمن لەو قۆڵەوە هێرشی دەکردە سەر گوندەکانی (ناودارۆکان‌و بیژکان) پێشمەرگەکانی تیپی ٨٥ی بەڕانەتی بە فەرماندەیی هەڤاڵێ تەحسین کاوانی‌و بورهان سەعید

سۆفی‌و عوسمان بانی مارانی‌و ئاسۆ، شەڕی دلێرانەیان لەگەڵ کردن پێشمەرگەکان لە شوێنێك دامەزرابوون بە ناوی (تەلان) توانیان تا کۆتایی شەڕەکە پارێزگاری لە شوێنەکانی خۆیان بکەن‌و دوژمن هەموو جار مەلول‌و شەرمەزار لە هێرشەکانی دەشکا.

٣. **قۆڵی لیسەتاس-بەرامبەر سوولاوك- پشتی گوندی سوسێ:** پێشمەرگەکانی تیپی ٩٣ کۆیە بە فەرماندەیی هەڤاڵ مامۆستا بەکر بەرگریان لێدەکرد بە سەدان گوللە تۆپ‌و ڕاجیمەی لە شوێنە گرنگەکان دانا، ڕۆژانە بە کۆپتەرەکان ئەو بەرزاییانەیان دەخستە بەر هێرشی دڕندانەی خۆیان لەبەرئەوەی پێشمەرگەکانی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێرو تیپی ٨٥ی بەرانبەتی ڕێگای ئەو بەرزاییانەیان بڕیبوو لە دوژمن لە پێشەوە دامەزرابوون تا ڕۆژانی دوای شەڕ دوژمن نەیتوانی هێرشی پیادەی بۆ بکات. لیسە تاس لە ڕووی سەربازییەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە دەڕوانێتە سەر ڕێگای گشتی زیارەت-سماقولێەکان‌و لە دیوی سەرەوەش دەڕوانێتە دۆڵی بێژکان‌و ناودارۆکان دوژمن دەیویست لە پشتەوە ئەو شوێنە پەکبخات بەڵام هەموو هەوڵ‌و تەقەلاکانی تا ڕۆژی ١٦/٩/١٩٨٧ بەفیڕۆ چو.

٤. **قۆڵی بەنەباوی - گردە چاك:** لەلایەن پێشمەرگە قارەمانەکانی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر پارێزگاری لێدەکرا لەبەرئەوەی بەرەی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر زۆر فراوان بوو وە زیاتر پێ دەشتەکانی گرتبۆوە بۆیە دەبێ زیاتر لەسەری بنووسین واتای ئەوە نیە بەرەکانی تری شەڕ گرنگ نەبوون نەخێر هەموو بەرەکان گرنگ بوون پێشمەرگەکانی هەموو تیپەکان ئازایانەو چالاکانە شەڕەکانی بە سوودی گەلی کورد یەك لایی کردەوە.

* هێزەکانی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بەم شێوەیەی خوارەوە دامەزرابوون، لەلایەن ڕێباز فەرماندەی تیپ سەرپەرشتی دەکرا:

**أ- قۆپی گراو:** کەرتی ٢ی لەگەڵ هەڤاڵ مەلا سلێمان جێگری فەرماندەی تیپ لێدامەزرابوون ئەو قۆپە دەڕوانێتە سماقوڵی سەرچاوە لە زنجیرە چیای بەنەباوی لە خوارەوەش دەڕوانێتە گوندی عەلیاوە. گرتنی ئەو قۆپە سماقولیاکان‌و سوسەو لیسەتاس دەخاتە بەردەستی دوژمن لە ڕووی سەربازیەوە زۆربەی ناوچەکانی شەڕ پەکدەخات.

ڕۆڵەکانی ٨٦ی دەشتی هەولێر بە هاوکاری لەگەڵ مەفرەزەیەکی هەڤاڵ کۆسرەت ماوەی دە ڕۆژ مەردانە بەرگریان لەو شوێنە بەرزە کرد دوژمن تەنیا بۆ ئەو لوتکەیە زیاتر لە بیست هێرشی یەك لە دوای یەکی کرد ڕۆژانە زیاتر لە سەد گوللە تۆپی قورس‌و راجیمەی بەسەر دەباراند کۆپتەرەکانیش بەنۆرە بۆردومانیان دەکرد. لە شەڕی سماقوڵی لوتکەی (گراو) دەوری

کاریگەری هەبوو لە یەکلا کردنەوەی شەڕەکە پێشمەرگەکان بە ئازایەتیو دلێری خۆیان سەرنجی دوژمنو پێشمەرگەیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا. لەبەر ئازایەتیو دڵسۆزانەی ئەو پێشمەرگەنە ناوی (ئەسحابەکانی ت ٨٦)یان لێنابوون، لە ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٦ لە نیوەڕۆ بە دواوە دوژمن لە چەندین لاوە چەندین هێرشی یەك لە دوای یەکی بۆ سەر ئەو لوتکەیە کرد، تۆپەکانیش بە خەستی شوێنەکانی تۆپباران دەکرد، کە تاریکی داهات لەبەر زۆری برینداری پێشمەرگەکان دوای ئەوەی فەرمانیان لە فەرماندەی تیپو هەڤاڵ کۆسرەت وەرگرت کشانەوە. کاتژمێر (٨)ی شەو دوژمن شوێنەکەی داگیرکرد بە گرتنی لوتکەی (کراو) بەرەکانی لیسەتاسو تەلانو سوسێو شوێنەکانی تر شڵەژا. لەو لوتکەیە سێ پێشمەرگەی ئازاو نەبەز سێ قارەمانی بەوەفایی گەلو نیشتمان سێ کوڕی خۆنەویست سێ پێشمەرگەی پاکو بێگەرد گیانیان کردە قوربانی خاکی پیرۆزی کوردستان، شەهیدان ڕەئووف نیەگینو شەهید یاسینو پێشمەرگەیەکی تر، کە ئەو دوو پێشمەرگەیە لە دەستەی هەڤاڵ کاك کۆسرەت بوون.

<u>**ب ـ داری جۆخین:**</u> دەکەوێتە خوار لوتکەی (کراو) لەسەر ڕێگەی سوسێ ونکە دەڕوانێتە سوسە لەلایەكو ونکە لەلایەکی تر. لەلایەن پێشمەرگەکانی کەرتی ٣ و کەرتی ٦ی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بەرگری لێدەکراسەرپەریشتیکردنیشی لە ئەستۆی هەڤاڵی تێکۆشەر جەلال ئیلنجاغیو مامەند مەنتك فەرماندەی کەرتی ٤ی بەردەباز بوو. بۆ پارێزگاری کردن لە لوتکەی (کراو) و سوسێ کە ئەو شوێنە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، دوژمن لە زۆر لاوە بەسەریدا زاڵبوو بەڵام هەڤاڵنمان هەمیشە سوودی شۆڕشو گەلەکەیان لا خۆشەویستر بووە لە گیانیان بۆیە ئەوانیش ئەركو ئازارو ناخۆشی زۆریان بینی تا ڕۆژی ١٩٧٩/٩/١٦ پاش داگیرکردنی لوتکەی کراو بە فەرمانی ئێمە شوێنەکەیان چۆلکرد.

<u>**ج ـ قۆپی (نیشتی):**</u> پێشمەرگەکانی کەرتی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی هەڤاڵ سوارە جەلال پارێزگاریان دەکرد، دەبابەکانی دوژمن بەرامبەر ئەوان لە (وشکۆر) بوون نەیانتوانی هێرش بهێنن لە هەمان کاتیش لوولەی تۆپی دەبابەکان ڕاستو ئاڕاستەی شوێنی پێشمەرگەکان بوو، ڕۆژانە دەیان تۆپی بەسەردا دەباراندن دیواری کۆنە ڕەبیەکانی هەموو تێكو پێکدا پێشمەرگەکان بە ئاستەنگ جێ گۆڕکێیان دەکردو ئاو و نانیان پێدەگەیشت سەرەڕای ئەوەش تاکو ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٦ شوێنەکانی خۆیان بەرنەدا وە بە فەرمانی ئێمە شوێنەکەیان بەجێهێشت.

د ـ گردە چاك: ئەو گردۆلكانەی پێش سوسێ دەگرێتەوە دوژمن لە گۆڕێ (خیوەتی) بوو مەفرەزەی تیپ‌و مەفرەزەیەکی کەرتی ١ی خۆمانم لەگەڵ بوو سەرەڕای ئەوەی سەرپەرشتی هەموو ئەو شوێنانەی دەکرد، کە تیپی ٨٦ی لێدامەزرابوون ئەو قۆڵەش ڕاستەوخۆ من سەرپەرشتیم دەکرد چەند جارێك دوژمن هێرشی هێنا بە هاوکاری لەگەڵ پێشمەرگەکانی ت ٩٣، کە لەسەر (لیسە تاس) دامەزرابوون هێرشەکانمان تێك شکاند بەڵام لە هەموو شوێنێك زیاتر تۆپبارانی لەسەر بوو. پێویستە بوترێ کاك بێستون هاوەنێکی لێ دامەزراندبوو جارجار گوللەیەکی دەگرتە دوژمن، دوژمنیش لە داخان ڕق‌و تووڕەییەکەی بەسەر ئێمەدا دەباراند ئەو شوێنەش پێشمەرگە تاکو کۆتایی شەڕەکە بەری نەدا.

لە ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٧ دوژمن بەپیادە هێرشی بۆ هێنا پاش تۆپ بارانێکی یەکجار زۆر قورس دیسان شکا.

ە. **قۆڵی گروژ سەری بە نەباوی تاقۆپی کراو:** لەلایەن پێشمەرگەکانی ت ٨٧ی قەرەچوغ ئەو تیپەی، کە بە مافی خۆیان بوونە قارەمانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەو تیپە نەبەزو دلێرە بوو کە بە هاوکاری لەگەڵ پێشمەرگەکانی ت ٨٦ی دەشتی هەولێر دزەخیان بۆ قوات تەوارئی هەولێر لە نزیك سەیتەرەی مەخمور دروستکرد، ئەو تیپە خاوەن دەیان داستانی پڕ لە سەروەری بوون. هێزەکانی دوژمن لە گوندەکانی کانی بی - قورتەلاس دەیویست بەسەر بەنەباوی سەربکەوێ پێشمەرگە قارەمانەکانی ئەو تیپە بە سەرپەرشتی هەڤاڵێ غەفور ئەحمەد غەزال‌و شەهیدی قارەمان دەشتی حەمەد ئەمین، پێشیان لێگرتن‌و دەیان لاشەی دوژمنیان خست، پاش چەندین هێرشی یەك لە دوای یەك، هێزێکی قوات خاسەی دوژمن توانی دزە بکات‌و بگاتە سەنگەری پێشمەرگەکان، پاش شەڕێکی دەستەویەخە توانیان شوێنەکان داگیربکەن پاش ئەوەی قارەمانی بە وەفای گەلەکەمان موهەندیسی شۆڕشگێڕو پێشمەرگە کاکە دەشتی حەمەد ئەمین سەنگەرەکەی بە خوێن ئاوداو بە یادگاری بۆ پێشمەرگەکان‌و نەوەی دووا ڕۆژ هێشتەوە. شەهید بوونی کاکە دەشتی تازە زاوا (کە هەشت ڕۆژ بوو بووکی گواستبۆوە) زەبرێکی کوشندە بوو لە بە تیپی ٨٧ی قەرەچوغ‌و پێشمەرگەکان کەوت.

شەهید دەشتی دۆستێکی نزیك‌و هاوڕێیەکی دڵسۆزو کوڕێکی ڕاستگۆی نێو هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو بە شەهید بوونی ئەو هەموومان تاساین، یادی بەخێر بێت.

بەشێك لە هێزەکەی تیپی ٨٦ی قەرەچۆغ لەناو باخچەکانی سماقوڵی گرتگ‌و سێ نان شەڕی ناو دارستانیان لەگەڵ هێزەکەی دوژمن کردو توانیان پاشەکشە بە دوژمن بکەن ئەو قۆڵە شەهید عەریف ئەکرەم‌و کاکە کەریم شینە (کەریمە ڕەش) سەرپەرشتیان دەکرد.

پێویستە ئەوەش بڵێین پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی عێراقی دەوری بەرچاویان هەبوو لەو شەڕە لە کەمینێکدا توانیان چەندین سەربازی دوژمن بکوژن‌و چەندین پارچە چەك‌و چەند سەیارەیەك دەسکەوتیان بێت.

هەڤاڵنی حزبی سۆسیالیستی کوردستان بە فەرماندەی هەڤاڵ سەید کاکە بەگوێرەی توانای خۆیان بەشداری شەڕەکەیان کردو کەمتەرخەمیان نەکرد.

پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و ئیسلامیەکان هەمیشە ئامادەییان هەبوو، وە لە چەندین پێکدادان لەگەڵ دوژمن بە گوێرەی ژمارەیان بەشداریان تیادا هەبوو، کە جێگای ڕێزە. دوژمن لە ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٧ لە کاتژمێر (٥) دەستی بە کشانەوەی هێزەکانی خۆی کرد زۆربەیان بە نارێك‌و پێکی. لە کاتێکدا زەبری کوشندەی لەو شەڕە لێکەوت لە کانی ماسی لەلایەن هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و بە پشتیوانی هێزێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان زەبرێکی کوشندەی لێدرابوو، لقی ١ی پارتی‌و برادەرانی خۆمان کانی ماسیان ڕزگار کردبوو.

لەو شەڕە پڕ لە قوربانیدانە لەو شەڕە ڕووبەڕوو بوونەوەیە دوژمن زەرەرو زیانی گیانی‌و ماڵی زۆری لێکەوت جگە لە زەرەری مەعنەوی. شەڕکردن کارێکی ئاسان نیە، خوێنی دەوێت، ماندووبوونی دەوێ دەبێ شەوخوونی بچێژی سەرەڕای دۆخی ناخۆشی‌و بە هێزی دوژمن‌و تۆپ‌و بۆردمانی فڕۆکەو هێرشی پیادەی دوژمن شەوانە لەگەڵ هەڤاڵن بە جیهازە بچووکەکان گەلێك قسەی خۆشمان لەگەڵ یەکتر بەسەر دەکردەوە، دەمانزانی گورگ هەندێکمان شەل‌و کوت دەکا بەڵام بێ باك لە مردن بەزم‌و هەرای خۆمان دەکردو سەرکەوتنمان لێدیاربوو کاك کۆسرەت یەکە یەکە لە هەواڵی بەرەکانی دەپرسی دەقی ڕووداوەکانمان پێ ڕادەگەیاند، جیهازی بچووك لە شەڕی جبهەدا دەوری کاریگەری هەیە. دوژمن سەری سوڕمابوو.. چۆن لەو دۆخە ناخۆشەدا ئەوانە قسەی خۆش لەگەڵ یەکتر دەکەن‌و پێدەکەنن ؟

ڕاستم وتووە: گەر بڵێم هەڤاڵ کۆسرەت دەورێکی یەکجار کاریگەری هەبوو لەو داستانە هەمیشە بڕوای بەهێزی خۆی دووبارە دەکردەوە کە دوژمن دەشکێ‌و کۆڵ دەدات .

ڕێکخراوی ی.ن.ك که هەڤاڵ شاخەوان لێپرسراوی بوو دەوری گرنگی خۆیان نواند لەو شەڕە ، کاك شاخەوان لێپرسراوی بەرەکانی لیسەتاس‌و تەلان بوو ، کادرە تێکۆشەرەکانیشی هەر کسە بە نۆرەی خۆی کەمتەرخەمیان نەدەکرد .
تۆپخانەی مەڵبەندی سێ که لەلایەن هەڤالان مامۆستا سەیفەدین ، کاك ڕێبوارو کاك بێستون‌و کاك تەلعەت خدر سەرپەرشتی دەکرا ، دەیان گوللە تۆپیان گرتە هێزەکانی دوژمن زەرەرو زیانی زۆریان بە دوژمن گەیاند .
شەڕی سماقوڵی دوژمنی هەژاند یەکسەر پاش کۆتایی هاتنی شەڕەکە لیواء روکن طالع خلیل رحیم الدوریان لە قائد فیلق لابردو روتبەکانی کەخۆی پێنەگینازیی‌و خۆی پێڕازاندبۆوە لێیان داماڵی‌و بەشەرمەزاری گەڕایەوە بەغدا ناوبراو کرا بە محافظی حلە، لەو شەڕە دەیان ئەفسەری پلەداری گەورە سەرپەرشتی هێزەکەی دوژمنیان دەکرد کەچی بەرامبەر هێزی پێشمەرگە بێ پلە شکان روتبە هەلگرتن هەر لەو کسانە دەوەشێتەوە کە ڕێز لە پلەکەیان دەگرن‌و لە پێشەوە شەڕ بکەن بە بڕوای من شەڕی پێشمەرگانە بەرزترین ئەکادیمیای عەسکەریە ڕۆژانی خەبات‌و تێکۆشان ئەوەی سەلماند . خەنجەر هەلگرتن بۆ ڕۆژی تەنگانەیە نەك بۆ خۆبادان‌و خۆهەلکێشان .
پێشمەرگە بێ پلەکان بێ روکن‌و ئەستێرەکان لە دەیان داستاندا ئەفسەرە پلەدارەکانیان شکاند .
ئەرکی سەربازیش تەنیا هونەری شەڕکردن‌و لێزانینە، لە داستانی سماقوڵی دووازدە قارەمانی دڵسۆزی گەلەکەمان شەهید بوون لەوانە: نەوزاد یوسف کاوانی برای کاك تەحسین کاوانی، کاك رەئوف نیرەگین، کاك جەرگۆ پیرداود ، کاك شوان، کاك ئازاد ، کاك یاسین لە دەستەی هەڤاڵ کۆسرەت‌و حسین دایزانی ......هتد.
ئەو شەهیدانە جێگای خۆیان لە مێژووی شۆڕشی گەلەکەمان دیارە هەمیشەو پێویستە لەیادمان بێت ڕێز بۆ کەس‌وکاریان دابنێین، داستانی سماقوڵی وانەو پەندی زۆری بە دوژمنداوە ، سەرفرازی‌و سەربەرزی بە پێشمەرگەو جەماوەری بەشەرەفی کوردستان بەخشی .
هەر زیندوو بێ یادی داستانی سماقوڵی هەر بۆ کورد بمێنن ئەوانەی بەشداریان هەبوو لەو شەڕەی دژی دوژمن .



نوسەری شەهید لەچەند دێڕێکدا

# رفعەت عەبدوڵا پیرداود

## ( شەهید ڕێباز )

- ١٩٥٢ لە شاری هەولێری دێرین لە بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەر لەدایك بووە .
- ١٩٦٥ پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بە نازناوی ڕەنجاو .
- ١٩٦٩ بە هۆی کارو چالاکی ڕێکخستنەوە لەلایەن ڕژێمەوە زیندانی کراوە .
- ١٩٧٠ لە دوای بەیانی ١١ی ئازار چالاکانە بەشداری کاریگەری هەبووە لە ڕێکخستن و خەباتی خوێندکاران و جەماوەر.
- ١٩٧٢ ئامادەیی کشتوکاڵی هەولێری تەواو کردووەو پەیوەندی کردووە بە شۆڕشی ئەیلولەوەو لە دەزگا جیاجیاکانی شۆڕشدا خەباتی کردووە تا نسکۆی ١٩٧٥.
- ١٩٧٥ بۆتە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ و پاشانیش پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.
- ١١ / ٥ / ١٩٧٧ لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا لەگەڵ هاوڕێی دێرینی خۆی شەهید شاخەوان بۆتە پێشمەرگە.
- کەسایەتیەکی هێمن و ڕۆشنبیرو ئازاو چاونەترس و لە خۆبوردو بووە.
- بەشداریی و سەرکردایەتی دەیان چالاکی و داستانی کردووە.
- ١٩٨٨ لەدوای ئەنفال بۆ ماوەی ١٤ مانگ سەرکردایەتی پارتیزانەکانی هەولێری کردووە.
- ١٩٩٠ لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی ( ی.ن.ك ) گەڕاوەتەوە سەرکردایەتی بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسێکی ئەورووپادا لەسەر کێشەی کورد.
- ١٩٩١ پێش چەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕین گەڕاوەتەوە ناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان.
- لە ڕاپەڕیندا بەشداری کاریگەرو بەرچاوی هەبووە لە ڕزگارکردنی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی سەر بە پارێزگای هەولێرو سلێمانی هەروەها ڕۆڵی کاریگەریشی

  هەبووە لە ڕزگارکردنی شاری کەرکوك بە تایبەتی لە گرتنی ڕەبیەکانی زنجیرە گردی دومەڵان.
- لە دوای ڕاپەڕین لەبەرەی کوردستانیدا لێپرسراوی سەربازی بووە بۆ چەسپاندنی یاساو خزمەتکردنی هاوڵاتیان.
- ١٩٩٣ بۆتە جێگری قیادەی منطقەی دهۆك لە وەزارەتی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان.
- نووسەری کتێبی قەندیل بەغدای هەژاند بەشی یەکەم و دووەمو ، دوو بەش ئرکەی کوردستانە.
- ٧ / ٥ / ١٩٩٤ دوای کاروانێکی پڕ لە سەروەری بە دیلی شەهید دەکرێت.
- ١٤ / ١١ / ١٩٩٤ تەرمی پیرۆزی لە کەرنەڤاڵێکی جەماوەری گەورەدا گەیەنرایەوە گۆڕستانی گردە ڕەشە لە شاری هەولێرو بەخاك سپێردرا.
- لە لایەن بەڕێز هەڤاڵ مام جەلال مەدالیای پارتیزانی بۆ شەهید ڕێباز بەخشراوە بە بنەماڵەکەیان.

بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

نرخی ( ٥٠٠٠ ) دینار